ئاستانە



# تەواوی وێنەکە ببینە


نووسینی: ئەحمەد یوسف سەید

وەرگێڕان: ڕێکخراوی ئاستانە

ناوی نووسەر : ئەحمد یوسف سەیید
ناوی وەرگێڕ : ڕێکخراوی ئاستانە
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : ڕێکخراوی ئاستانە
نۆبەتی چاپ : یەکەم ٢٠٢٢
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (      ) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە

# تەواوی وێنەکە ببینە

## «بۆ گەڕانەوەی دڵنیایی و چەسپاندنی بنەماکان»

نووسینی:

ئەحمەد یوسف سەیید

وەرگێڕانی:

ڕێکخراوی ئاستانە

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، سەلات و سەلامی خوا لە سەرداری پێغەمبەران و خانەوادەی پاک و هاوەڵانی.

پاشان:

چیرۆکی ئەم پەڕتووکە لە ١٠ی مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی (١٤٣٣ کۆچی/٢٠١٢ زایینی) دەستی پێ کرد، کاتێک یەکەم بەشی زنجیرەی (کامل الصورة) م لە کەناڵەکەم لە یوتیوب بڵاو کردەوە، ئەوکات بە خەیاڵیشمدا نەدەهات کە ئەم زنجیرەیە درێژە بکێشێت تا نووسینی ئەم دێڕانە لە نیوەی مانگی سەفەری ساڵی (١٤٣٩ کۆچی).

لە ماوەی ئەم شەش ساڵەدا و لە دەروازەی بەرنامەی (کامل الصورة) ەوە چەند ڕێڕەوێکی گرنگم بەڕوودا کرایەوە. ڕەنگە گرنگترینیان ئەوە بێت کە پەیوەندییەکی بەردەوامم لەگەڵ توێژێکی فراوان لە گەنج و لاواندا پەیدا کرد، کە هەر لە بنەڕەتەوە زنجیرەکە دواندنی ئەوانی بە ئامانج گرتبوو، ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو. گەشەکردنی ئاستی زانیاری و ئاگاییم لەمەڕ ئەو پرسیار و ئاڵنگارییە هزرییە بەردەوامانەی لەڕێگەی ترومپا زەبەلاحەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەخێرایی بڵاو دەبنەوە و مێشک و بیری لاوان بە خۆیانەوە سەرقاڵ دەکەن.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش بازنەی پەیوەندییەکان لە هەردوو لاوە فراوانتر دەبوون، تاوەکوو لە ئەنجامدا بەرنامەی) صناعة المحاور) هاتەبوون، کە ئێستا لە لایەکەوە دەستەبژێرێک لە فێرخوازانی زانستی شەرعی و

ماماۆستایانی قەدرگران کاری لەسەر دەکەن، لە لاکەی دیکەشەوە هەزاران کەس سوودی لێ دەبینن، هەموو ئەمانەش فەزڵ و چاکە و منەتی خودای گەورەن.

## گرفتی هەڵبژاردنی ناونیشان:

هەرکەسێک لە بواری نووسین یاخود بەرهەمهێنانی بەرنامەکاندا کاری کردبێت دەزانێت کە هەڵبژاردنی ناونیشان خۆی لە خۆیدا ئاڵنگارییەکی گەورەیە، چونکە لەبەرچاوکردنی مەرجەکانی: نوێیەتی، هەڵنان و پەرۆشکردن، گوزارشت لە ناوەڕۆک، کورتبڕی (کە خواستەکانی ناونیشانێکی باشن) و کۆکردنەوەی ئەمانە لە تاقە ناونیشانێکدا بوارەکانی هەڵبژاردن بەرتەسک دەکەنەوە و بەگەڕخستنی وزەیەکی زیاتر لە مێشک و بیری مرۆڤ دەخوازن، بۆیە زۆرجار خاوەنی بەرنامە و پرۆژەکان لەپێناو دەستنیشانکردنی ناونیشانێکدا کۆڕ و دانیشتنی ڕاوێژکاری دەبەستن کە پێی دەگوترێت (دانیشتنی بیرۆکەباران).

بەهەرحاڵ، پێش بڵاوکردنەوەی یەکەم ئەڵقەی بەرنامەکە، لای خۆمەوە هەستام بە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە لەو قۆناغەدا هێشتا ئاشنای کەسانێک نەبووبووم کە لەو بوارەدا هاوکارم بن، کە دواتر هەر لە بەرەکەت و فەڕی دەستپێکردنی ئەم بەرنامەیەوە ئاشنای کەسانێک بووم کە گرنگی بەم لایەنە دەدەن و بە فەزڵی خودای گەورە پەیوەندی پتەو لەنێوانماندا گەشەی کرد و هاوکار و ئەزیزانێکم ناسی کە لە بەخششە پێشخراوەکانی ژیانی دونیان.

بۆ هەڵبژاردنی ناونیشانەکە لە گۆشەنیگایەکەوە دەستم پێ کرد کە تێبینیم دەکرد لە کەسانی کارتێکراودا بەو گومانانەی لەسەر نەگۆڕەکانی

دەورووژێنرێن، ئەویش بێئاگایی و نەبوونی زانیارییەکی ئەوتۆیە لەبارەی ئەو پرسەی گرفتیان تێیدا هەیە؛ بەڵکوو تەماشاکردنی لە گۆشەیەکی تەسکەوە کە تەنیا بەشێکی وێنەکە دەردەخات و بەشەکانی دیکەی دەشارێتەوە.

بۆیە دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، ناونیشانی (کامل الصورة - وێنە گەورەکە ببینە)م هەڵبژارد، وەک ئاماژەیەک بۆ گرنگی تێگەیشتن و وێناکردنی تەواو بۆ ئەو پرسانەی بە مشتومڕ و ڕەخنەکارییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.



## لە وێنەوە بۆ پەڕتووک:

پاش تۆمارکردن و بڵاوبوونەوەی شازدە ئەڵقەی بەرنامەکە، بیرۆکەی نووسینەوە و ڕێکخستنەوەیم بۆ هات بە داڕشتنێک کە گونجاو بێت بۆ بڵاوکردنەوەی لە دووتوێی پەڕتووکێکدا، بە فەزڵی خودای گەورە ئەو کارەش تەواوکرا و پەڕتووکەکە لە پێشانگای نێودەوڵەتی ڕیاز لە ساڵی (١٤٣٥ کۆچی) کەوتە بەردەستی خوێنەران، پاشان لە ساڵی دواتردا بەشی دووەمی بەدوادا هات (١٤٣٦ کۆچی) کە هەشت ئەڵقەی نوێی دیکەشی لەخۆگرتبوو.

سوپاسی خودای گەورە دەکەم لەسەر ئەو گرنگیپێدانەی بە هەردوو بەشی پەڕتووکەکە درا لەلایەن لاوانەوە و لە یانەکانی خوێندنەوە و چەندین جێگەی تریش، هەروەک دڵخۆش بووم بەوەی هەندێک لە مامۆستایانی بەڕێزی زانکۆ لەناو وانەکانیاندا سوودیان لە هەندێک لە بەشەکانی بەرنامەکە وەرگرتبوو، چ بە نیشاندان و چ بە ڕێنمایی کردنی خوێندکاران بۆ تەماشاکردنیان.

دوای نەمانی پەڕتووکەکە لە بازاڕدا، چەند هاوڕێ و هاوکارێکم لە ناوەندی «تەکوین» ویستیان پەڕتووکەکە لە چاپ بدەنەوە ،پێشنیاری کۆکردنەوەی هەردوو بەشەکەیان لە یەک پەڕتووکدا بۆ کردم، منیش بیرۆکەکەم بە باش زانی، بۆیە دەستم کرد بە کارکردن لەسەر دووبارە ڕێکخستنەوە و نووسینەوەی پەڕتووکەکە. لە ڕاستییدا وا گومانم دەبرد لە ماوەیەکی کەمدا لەو کارە ببمەوە، هەر واشم بە بڵاوکارەکان دەگوت کاتێک پرسیاری پەڕتووکەکەیان دەکرد، بەڵام بینیم نووسین و پێداچوونەوە ماوەیەکی درێژتر دەخوازێت، بەتایبەت کە من بابەتگەلێکی زۆر و فرەچەشنم بۆ پەڕتووکەکە زیادکرد، بێگومان سەرقاڵییەکانی تریش هەندێکجار دەستیان دەگرتم.

ئەمەش پەڕتووکەکەیە دوای لێکدانی هەردوو بەشەکە و ڕێکخستنەوە و نووسینەوە و هەندێک دەستکاری کردن، دەیخەمە بەردەستی خوێنەرانی هێژا لە چاپی یەکەمیدا کە ڕەنگە چاپی دیکەشی بەدوادا بێت.

لە خودای گەورە داواکارم یارمەتیدەر و پشتیوانمان بێت و کارڕاستی و تەوفیقمان پێ ببەخشێت.

ئەحمەد یوسف سەیید

مانگی سەفەری (١٤٣٩)ی کۆچی

ASTANA

# بەشی یەکەم

## بەڵگەکانی ڕاستێتی بنەماکانی ئیسلام

**یەکەم:** سەلماندنی بوونی خودای بێهاوتا

**دووەم:** ئامانجی بوون

**سێیەم:** سەلماندنی پەیامبەرێتی موحەممەد(ﷺ) و ڕاستییەتی قورئان

**چوارەم:** جوانییەکانی ئیسلام

## سەلماندنی بوونی خودای بێهاوتا

کاتێک کەسێکی گومانداری پەشۆکاو دەپرسێت: «بەڵگە چییە لەسەر بوونی خودا؟ »، گرنگە پێش وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی لە سروشتی ئەو بەڵگەیە دڵنیاببینەوە کە بۆ سەلماندنی بوونی خودا دەیەوێت، ر خودا هەیە چ بگات بە مولحیدانی نکوڵیکار بەڵگە ئاشکرا و ئاسان و نزیکەکان پشتگوێ دەخەن و ڕێگاگەلێکی دوور و دژوار پەسەند دەکەن،

ئەمانە هەرچەندە بەڵگە و ئاماژەی ڕوونیان بۆ بهێنینەوە، سوودیان پێ ناگەیەنێت، تا لەگەڵ پەسەندکارییە کەسییەکانیان یەک نەگرێتەوە، هەر وەکوو نەوەکانی ئیسرائیل بە موسایان گوت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ۝٥٥﴾ [البقرة: ٥٥]

واتە: «هەتا بەئاشکرا و بە چاوی خۆمان خودا نەبینین، هەرگیز بڕوا ناکەین ئەم پەڕتووکەت لەلایەن خوداوە بۆ هاتبێت.»

لێرەدا ئەوان بەڵگەی قایلکەریان تەنیا لە بینینی هەستەوەریدا کورت هەڵێنا، ئەوەش چەواشەکارییەکە لە هەموو سەردەمێکدا و تا ئەمڕۆش بە میرات بۆ چەواشەکارانی بێباوەڕ بە خودای گەورە و پێغەمبەرەکەی ماوەتەوە.

لەکاتێکدا ئەگەر لە هەموو ئەو بەڵگە و نیشانانە وردبیتەوە کە دەمانگەیەننە زۆربەی ڕاستییە نەگۆڕ و بێ گومانەکان لە بوارە جیاوازەکاندا، دەبینیت کە هەرگیز لە هەستی بینیندا کورت هەڵنەهاتوون، هەر بۆ نموونە: باوەڕی تەواومان بە بوونی هەندێک لە کەسایەتییە مێژووییەکانی

وەکوو ئەفلاتوون و ئەرستۆ و سەلاحەدینی ئەیووبی لەڕێگەی بە چاو بینین یاخود هەستەوەرێکی ڕاستەوخۆوە نییە، بەڵکوو لەسەر بنەمای هەواڵ و خەبەردانە کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی زانیین و بەدەستهێنانی.

لەڕاستییدا سەلماندنی بوونی خودا بابەتێکی هێندە نزیک و کۆکە لەگەڵ فیترەت و عەقڵی مرۆڤ کە بۆ گەیشتن پێی پێویستی بە کۆششێکی ئەوتۆی عەقڵ نییە، چونکە ئەم پرسە لەسەر بنەمایەک ڕاوەستاوە کە لە عەقڵی گشت مرۆڤێکدا ڕیشەی داکوتیوە و هیچ کات ناتوانێت دەستبەرداری ببێت، ئەویش بنەمای (بەڵگەهێنانەوە بە شوێنەوار و جێ دەست لەسەر بوونی کارتێکەر لەپشتییەوە)، بگرە تێکڕای بێدینانیش کە خۆیان لە بوونی خودای گەورە هەڵە دەکەن لە هەموو کاروبارەکانی ژیانیان ئەم بنەمایە پەیڕەو دەکەن، ئەگەرچی لەبابەتی خودادا نکۆڵی لێ بکەن.

گەڕان بەدوای کارا و کارتێکەر و پێشهێنەری پشت کار و شوێن دەست و پێشهاتەکان کارێکە مرۆڤەکان ناتوانن دەستبەرداری بن، مەگەر لە دۆخی لە دەستدانی ژیرییاندا، چونکە ناگونجێت پێشبینی بەدیهاتنی شتانێک بکەن کە پێشتر نەبوون بەبێ بوونی هۆکارگەلێکی یەکانگیر لەگەڵ سروشتی ئەو بەدیهێنراوانە.

ئەگەر ژیری مرۆڤ ڕێگەی پێ نەدات خەیاڵی دروستبوونی وێنەیەکی بە کارامەیی کێشراوی مرۆڤێک لەسەر پەڕەیەکی سپی بکات بەبێ بوونی هۆکار و وێنەکێشێکی بەئەزموون لە پشت ئەو وێنەیەوە، کەواتە ئەندێشەی دروستبوونی خودی مرۆڤەکە بەبێ بوونی ئافرێنەرێکی توانا و زانا لە پێشترە بەوەی عەقڵ و ژیری ڕەتی بکاتەوە!

بە هەمان شێوە بۆ هەموو ئەو شتانەش کە لە نەبوونەوە دروستبوون.

هەتاوەکوو بەدیهێنراوەکەش وردی و ئاڵۆزی زیاتر بێت، پێویستی گەڕان

بەدوای ئافرێنەرێکدا کە ئەم وردەکاری و کارامەییەی لێ دەوەشێتەوە لە ناخی مرۆڤدا زیاتردەبێت، چونکە عەقڵی مرۆڤ لەمەڕ دروستبووەکان تەنیا بە بوونی هۆکارێک لەپشتیانەوە قایل نابێت، بەڵکوو دەبێت ئەو هۆکارە لەئاستی ئەو سیفەتانەدا بێت کە لە دروستکراوەکەدا هەیە، ئەگەر عەقڵمان ڕێگە نادات خەیاڵی ئەوە بکەین کە بۆ نموونە منداڵێکی هەشتساڵان هەستێت بە دروستکردنی ئامێرێکی کۆمپیوتەر بەهۆی سیستەمە زۆر ورد و ئاڵۆزەکەیەوە کە زانست و شارەزایی و عەقڵێکی پێگەیشتوو دەخوازێت بۆ دروستکردنی، ئاواش ناشێت قایل بین بەوەی بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرەی لەوپەڕی وردەکاری و ملکەچییدایە بۆ وردترین ڕێساکان زاتێکی نەزانکار یاخود دەستەوسان بێت، چ بگات بەوەی بوونەوەر لە بنەڕەتەوە بێهوودە و بەبێ بوونی دروستکارێک دروست بووبێت.

هەرچەندە ئەم پرسە لەوپەڕی ڕوونی و سانابیدایە، بەڵام زۆرێک لە خەڵکی پشت لەم ئاسانی و ڕۆشنییە دەکەن و ڕێگا نزیکەکان دوور دەخەنەوە، ئەوەی دەبوو بەئاسانی وەربگیرێت ئەوان پێچ و پەنای تێدەخەن و لەسەر خۆیانی قورس دەکەن، بۆیە داوای بەڵگەگەلێکی ئاڵۆز دەکەن لەبارەی بوونی خودای گەورەوە کە هیچ کات ناسینی خودا پەکی لەسەر ئەو بەڵگانە نەکەوتووە.

دوای تێڕامان لە کۆی ئەو کێشمەکێشم و و ڕەخنانەی لەم بوارەدا دەورووژێنرێن دەبینین کە سەرچاوەکەیان بۆ یەکێک لەم چوار هۆکارە دەگەڕێتەوە:

**یەکەم:** گرفتی لادان لە بواری سەرچاوەکانی زانین و ئامڕازەکانی بەدەستهێنانی.

مەبەست لە لادانی پەیوەست بە بواری سەرچاوەکانی مەعریفە بریتییە لە کورتهەڵێنانی ڕێگاکانی دەستکەوتنی زانیاری لە یەک سەرچاوەدا و

فەرامۆشکردنی سەرچاوەکانی تر.

گرنگترین ئەو سەرچاوانەش کە دەکرێت لە ڕێگەیانەوە زانیاری بەدەستبخەین ئەمانەن: عەقڵ، هەست (حس) وەکوو بینین و بەرکەوتن، (خەبەر) هەواڵی ڕاست لە کەسی ڕاستگۆوە، هەروەها لە زگماک و فیترەتیشەوە بڕێک لە زانیارییە سەرەتاییەکان بەدەست دەخەین کە بە بناغەی زانیارییە بەدەستهاتووەکانی دواتر دادەنرێن.

**نموونەی لادان لە سەرچاوەکانی زانیین**

ئەگەر بە مولحیدێک بڵێیت: ئێمە باوەڕمان بە بوونی خودای گەورە هەیە بە پشتبەستن بە بەڵگە عەقڵییە نەگۆڕ و چەسپاوەکان و لەسەر بنەمای فیترەتیش.

ئەو پێت دەڵێت: بەڵام من تەنیا متمانەم بە بەڵگە هەستی و ئەزموونکراوەکان هەیە کە پشتبەستوون بە تێبینیی کردنی تاقیگەیی، لەبەرئەوەش کە بەڵگەکانی بوونی خودا لەو جۆرە نین و ئەو باوەڕیان پێ ناهێنێت.

ئەم بێباوەڕییە هۆکارەکەی لادانە لە بواری سەرچاوەکانی مەعریفە، لەگەڵ خۆبەزلزانیین لەئاست گەردنکەچی بۆ ڕاستییەک کە سەرپێچی هەوا و ئارەزوو دەخوازێت.

**دووەم**: تێنەگەیشتن لە بەڵگەکانی باوەڕداران و یەکسانکردنیان لەگەڵ گومانی بێدینان.

زۆرجار مولحیدان گاڵتەیان بە بەڵگەکانی باوەڕداران دێت لەسەر بوونی خودا و وێنایەکی ناڕاستی بۆ دەکەن کە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی نەشارەزا وا گومان ببات ئەو بەڵگانە هیچ نین جگە لە هەڵەکاری و

دەمارگیری و ئیمانێکی چەقبەستوو، لەکاتێکدا ئەمە دوورە لە ڕاستییەوە.

**نموونەش بۆ ئەم هەڵەیە:**

بە یەک چاو تەماشاکردنی ئەو بنەما عەقڵییە زگماکییە پێویستکەرەی کە «هەموو بەدیهێنراوێک دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت» لەگەڵ گریمانەیەکی خەیاڵی بێسەروبەر کە «بێرتراند ڕەسڵ» دایناوە، ئەویش بە لێکچوواندنی ئەگەری بوونی خودا بە گریمانەی بوونی قۆرییەک لە بۆشاییی ئاسمان کە نە دەتوانین بیسەلمێنین نە نکۆڵیشی لێ بکەین، ئەمەش هەڵەکارییەکە لە دەرەنجامی یەکسانکردنی دوو پرسی زۆر جیاوازەوە دروستبووە، چونکە قۆری هیچ شوێنەوار و کاریگەری و شوێندەستێکی نییە، لەکاتێکدا هەرچی لە بوونەوەردا دەیانبینین لە کاریگەری و شوێنەوارەکانی بوونی خودا و ڕاگرێتی و هەڵسورێنەرێتی ئەون.

**سێیەم**: بانگەشەی دەرەنجامگەلێکی ناڕاست کە مەرجی پابەندکارییان تێدا نییە

گومانی تێدا نییە کە یەکێک لە مەرجەکانی دەستی بەڵگەهێنانەوە ئەوەیە کە بەڵگەکە بە ڕێگایەکی پابەندکەر دەرەنجامەکە بسەلمێنێت، بەڵام بەڵگەهێنانەوە بە هەندێک بەڵگەی ڕاست بۆ سەلماندنی دەرەنجامگەلێکی هەڵەی ناپەیوەند بەو بەڵگانە، بە واتایەکی تر

«ئەنجامگیری هەڵە لەسەر بنەمای بەڵگەگەلێکی ڕاست»؛ ئەمەیان چەواشەکارییەکە زۆرێک لە مولحیدان و ئەوانەش ئەنجامی دەدەن کە گومانەکانی دژ بە سوننەت و نەگۆڕەکانی ئیسلام دەورووژێنن.

**لە نموونەی ئەمەش:**

بەڵگەهێنانەوە بەو بیردۆز و ڕێسا زانستییانەی باس لە جووڵەی

گەردوون و دروستبوونی بوونەوەران دەکەن لەسەر نەبوونی خوڵقێنەر، ئەم بەڵگەسازییەش هیچ پابەندکارییەکی تێدا نییە، چونکە هەبوونی ئەو ڕێسایانە هەرگیز نەبوونی ڕێکخەر و کارسازێک ناسەلمێنێت.

**چوارەم**: خۆبەزلزانیین و ئارەزوو

لەڕاستییدا عەقڵ و ژیریی مرۆڤ لە دۆخی ئاسایی دوور لە کارتێکەرەکاندا هەرگیز ناتوانێت قایلبێت بەو گریمانەیەی کە ئەم گەردوونە و ئەوەشی کە تیایەتی بە هەڕەمەکی و لە ئەنجامی ڕێکەوتەوە دروست بووە، هەروەها دانىان بە بوونی بەدیهێنەرێکی مەزنی زانای بەتوانا لەپشت ئەم هەموو وردەکاری و ڕێکوپێکییە کە ملیۆنان نموونەی ئاشکرا لە مرۆڤ و گیاندار و گەردووندا دەیسەلمێنن کە بابەتێکە فیترەتی ساغ دەیخوازێت و عەقڵی بینا پێویستی دەکات، دەروونی مرۆڤ بۆی دەشنێ و لە پەنایدا ئۆقرە دەگرێت، گومانیشی تێدا نییە نکۆڵی کردن لەم ڕاستییە تەنیا بەهۆی زۆربوونی ئەو گومانانەوە ڕوودەدات کە لەگەڵ تێڕوانینی دروستی عەقڵ و فیترەتی ساغ تێک دەگیرێن، لەگەڵ تێکەڵەیەک لە پاڵنەری هەوا و ئارەزوو و خۆبەزلزانی کە وا لە مرۆڤ دەکەن بەرهەڵستی بکات لە گەردنکەچی و ملدان بۆ خودای گەورە و سەرپێچیکردنی حەز و ئارەزووەکانی نەفس. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ [غافر: ٥٦]

واتە: «بەڕاستی ئەو کەسانەی دەمەقاڵێ و دەمبازی دەکەن لە ئایەتەکانی خودادا بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت لە سینەیاندا، خۆبەزلزانیین نەبێت بەرانبەر بە حەق شتێکی تر نییە و دەیانەوێت حەق باتڵ بکەنەوە، هەرگیز ئەوان بە مەبەستیان ناگەن، جا کەوابوو تۆ پەنا بەرە بەر خودا، چونکە بەڕاستی ئەو بیسەری بینایە.»

## ئامانجی بوون

ئەگەر هەموو شتێک لەم گەردوونەدا هەر لە بچووکترین خانەی لەشی مرۆڤەوە تا گەلەستێرەکان و تاوەکوو گشت دۆزینەوە بێکۆتاکانی ناو ئەم گەردوونە فراوانە بەڵگە بن لەسەر بەڕێکەوت دروستنەبوونی بوونەوەر، ئەوا بەهەمان شێواز بەڵگەشن لەسەر بێهوودە نەبوون و هەبوونی مەبەستێک لە ئافراندنیان.

هەروەها سەلماندنی ئامانج و نکۆڵی لە بێهوودەیی پرسێکە لەسەرووی باوەڕنەبوون بە ڕێککەوت و هەڕەمەکیبوون، چونکە باوەڕنەبوون بە ڕێکەوت تەنیا داننانە بە بوونی خولقێنەرێک لەپشت ئەو شتە بەدیهاتووەوە، بەڵام ڕەتکردنەوەی بێهوودەیی بەو واتایە دێت ئەم خولقێنەرە حیکمەت و ئامانج و مەبەستێکی هەیە لە ئافراندنیدا نەک لەخۆڕا و بەبێ هوودە دروستی کردبێت.

ئەگەر لەم گەردوونە گەورەیە ڕابمێنیت دەبینیت:

- وردەکارییە سەرسووڕهێنەکەی
- ڕێکخستنە تۆکمە دەستەوسانکەرەکەی
- جوانییە سەرسامکەرەکەی
- هەماهەنگییە سەیر و سەمەرەکەی
- ڕۆیشتنی لەسەر ڕێسا ڕێکخراو و نەگۆڕە گەردوونییەکان کە چاوی زانایان

لەئاست وردی بێپایانیدا ئەبلەق دەبێت

- جوانسازی و تەواوی لە وردترین و بچووکترین شتەکاندا) وەک خانە و فەرمانە سەرسووڕهێنەرەکانی و ئەو زانیارییە بۆماوەییبیانەی لەخۆی گرتووە)

- چەندان نموونەی تریش لە بەڵگە لەبن نەهاتووەکانی وردی و کارامەیی لە بەدیهێنانی گەردوون و مرۆڤدا.

هەموو ئەمانە لای کەسێکی عەقڵمەند کە لێیان ڕادەمێنێت بەڵگەگەلی ئاشکران بۆ بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی بێهوودەیی و بێئامانجی لە بەدیهێنانیاندا، وەک چۆن خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ [الأنبياء: ١٧]

واتە: «ئەگەر بمانویستایە یاری و گەمەیەک بسازێنین، لەلایەن خۆمانەوە دەمانسازاند، ئەگەر بڕیار بێت کاری وا بکەین.»

خۆ ئەگەر باسەکە تەنیا گەمە و گاڵتەیەکی بێهوودەیە، کەواتە ئەم هەموو وردەکاریی و کارامەییە سەرسامکەرە لەپێناو چی؟

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّما خَلَقْناكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنا لا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتعالى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾ [المؤمنون: ١١٥-١١٦]

واتە: «ئایا پێتان وابوو ئێوەمان بە گەمە و بێهوودە دروستکردووە و قەتیش بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە بۆ سزا و پاداشت؟ بەرزی و بڵندی هەر بۆ خودای پاشا و فەرمانڕەوای حەقە، هیچ پەرستراوێکی حەق جگە لەو زاتە نییە، کە پەروەردگاری عەرشی بەڕێز و بەرزە.»

کەواتە بە تێڕامان لە دروستکراوان و بەکارخستنی بنەمای «بوونی شوێندەست بەڵگەیە لەسەر بوونی کارایەک لەپشتییەوە.» دەگەین بە

حەقیقەتی بوونی ئامانج و حیکمەتێکی مەزن لە بووندا، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: ئەم ئامانجە گەورەیە چییە و چۆن دەیزانین؟

ئەگەر ئێمە بوونی خولقێنەری گەورە و کاربەجێمان سەلماند، پاشان بە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا سەلماندمان کە ئەو پێغەمبەرانێکی ناردووە و پەڕتووکگەلێکی دابەزاندووە تا مەبەست و ویستی ئەو بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە کە خودا یار بێت دواتر ئاماژە بەو بەڵگانە دەدەین، ئەوکات گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارە لەنێو پەیامی خودی خودای بەدیهێنەر و ڕێکردن لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانستەی بۆ پەیامبەرەکانی دابەزاندووە کتومت ئەو کارەیە کە عەقڵی ساغ و کرۆکی دانایی دەیخوازێت.

چونکە کاتێک مرۆڤ لە گەشتی گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارە گەورەیەدا ڕێی لە چاوگێکی هیدایەت و ڕێنوێنی دەکەوێت و دڵنیاش دەبێتەوە کە ئەم سەرچاوەیە بنەمای هەموو مەعریفە و بنەچەی گشت زانستێکە و تەواوی هۆکاری بوونە، ئەوکات ڕوو وەرگێڕان و گەڕان لەدووی ڕێگەچارەیەکی تر تەنیا بەڵگەیە لەسەر نەزانی یان خۆبەگەورەزانی کەسەکە.

لەڕاستییدا خودای گەورە وەک چۆن چەندین نیشانە و یاسای بۆ مرۆڤەکان داناوە کە بە هۆیانەوە ڕێگەکانی وشکانی و ئاوی و ئاسمانی دەبڕن و کارلێکیان لەگەڵ دەکەن و لەژێر ڕۆشنایی ئەو یاسایانەدا بەرەو ئاسۆ فراوانەکانی ماددە دەچن، هەر ئەویش نیشانەگەلێکی هیدایەتی بۆ داناون تا لە ڕێگەیانەوە بە ڕاستییە مەعریفییە مەزنەکانی ئامانجی بوون بگەن کە بوونەوەر لەپێناویدا بەدیهێنراوە.

مەگەر مرۆڤ لە چالاییەکانی وێڵی و لاوازی پەنا بۆ کوێ ببات ئەگەر دوور بێت لە ڕووناکی ئەو وەحییەی خودا بۆ ڕۆشنکردنەوەی عەقڵی ئەو و حەوانەوەی ڕۆحی ئەو ناردوویەتی؟

لەڕاستییدا مرۆڤ سواری کەشتی بۆچوونە پەتییەکانی خۆشی تاقی کردەوە، لە سۆراخی ڕاستییە مەزنەکانی گەردووندا و بەبێ پشتبەستن، بە هیچ بەڵگەیەکی دەرەکی خۆی لە چەندین دەریای توێژینەوە و هەڵوەدایی دا، بەڵام هەرگیز بە وەڵامێکی قایلکەر نەگەیشت کە دڵی ئاسوودە بکات.

بەڵێ، ڕەنگە بە ڕوانینی دروستی عەقڵ، عەقڵێکی پاکی کارتێنەکراو (کە ئەم عەقڵانە زۆر کەمن) بگات بە باوەڕی بوونی خولقێنەرێک بۆ ئەم بوونەوەرە، لەگەڵ هەندێک سیفەت کە دەبێت هەیبێت، تاوەکوو پێویستی ئامانجداری و بێهوودە نەبوونی ئەم دروستکراوانەش، بەڵام ئایا ئەمە هەموو شتێکە؟

ئێمە کە زانیمان ناکرێت بوونەوەر بێهوودە بێت و جەختمان لە پێویستی بوونی ئامانج و مەبەستێکی مەزن کردەوە، ئەی چۆن و بە چ ڕێگەیەک بگەین بە دیاریکردنی ئەو ئامانجە؟

بێگومان مرۆڤ دەیەوێت بە زانیاری تێر و تەسەل بگات لەبارەی خولقێنەری خۆی و گشت بوونەوەرانەوە، دەیەوێت بیناسێت و پەیوەندی لەگەڵ هەبێت، ئەو لەناخییدا بەگەورەزانین و بەرزڕاگری هەستپێ دەکات، بەڵام دەشیەوێت بزانێت خۆی چ شێوەیەک لە بەگەورەدانانی پێ باشە تا ئەم ئەنجامی بدات، دەیەوێت شکۆمەند ڕای بگرێت و ستایشی بکات، لەم ئافرێنەرە مەزنە دەخوازێت ئازارەکانی سارێژ بکات، هێز بە لاوازییەکانی ببەخشێت و ڕێگەی بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

مرۆڤ دەیەوێت سەرەتای بوون و چارەنووسی ژیانی بزانێت، دەیەوێت بزانێت بەدیهێنەر چی لێ دەوێت، پێویستی بە ڕاگەیەنراوێکی دڵنیاکەرەوەیە لە زاتێکەوە کە حەقیقەتی هەموو شتەکان دەزانێت و بە زانستی دەوری داون، تا بە ئاسانی سەروو هەستپێکراوەکان بزانێت، وەڵامی ئەو پرسیارانە بدۆزێتەوە کە بیری سەرقاڵ کردوون.

لەبەرئەوەیش کە خولقێنەر خاوەنی تەواوترینی سیفەتەکانە، حیکمەت و میهرەبانی ئەو دەخوازێت ئەم ڕاستییانە بۆ مرۆڤ ڕوون بکاتەوە، ئەویش لەڕێگەی بژاردەیەکی پاڵفتەی ناو مرۆڤایەتی کە لەوپەڕی ڕاستبێژی و دەستپاکی و پارێزکاریدان و خودای گەورە بە زانستی خۆی هەڵی بژاردوون، چونکە: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ [الأنعام: ١٢٤]

واتە: «خودا خۆی باشتر دەزانێت پەیامی خۆی لە کوێ دابنێت و چ کەسێک بکات بە پەیامبەر.»

چەندان بەڵگە و نیشانەش لەسەر ڕاستێتی پەیامەکەیان و ڕاستی پەیامبەرێتییان بەرپادەکات.

کاتێک لە قورئانی پیرۆز ڕادەمێنین کە دوایین پەیامی نێردراوی پەروەردگارە بۆ بەندەکانی، دەبینین بەشێکی زۆری ئایەتەکانی قورئان خودای گەورەمان پێ دەناسێنن، تەنانەت گەورەترین و شکۆداترین ئایەت لەم پەڕتووکە مەزنەدا کە ئایەتی (الكرسی) یە لەبارەی ناساندنی خودای گەورەوەیە، گەورەترین سوورەتیش لە قورئاندا سوورەتی (الفاتیحة) یە هەر سوپاسگوزاری و ستایش و پشت پێ بەستن و داوای یارمەتی کردنە لە خودا. هەروەها ئەو سوورەتەش - کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) جێگیر بووە- هاوتای سێیەکی قورئانە، سوورەتی (الإخلاص) ە، هەمدیسان پێناسەی خودای گەورە و باس لە شکۆ و مەزنایەتی ئەوە، هەر خۆشی دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا﴾ [الطلاق: ١٢]

واتە: «خودا زاتێکە کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە و بە وێنەی ئەوان زەویشی دروست کردووە، فەرمانی خودا لەنێوانیاندا دادەبەزێت تا چاک بزانن کە خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە و بێگومان خودا بە زانیین دەوری هەموو شتێکی داوە.»

بۆیە ئەم دوا پەیامە خودابییە مرۆڤایەتی بە گەورەیی و شکۆ و کەماڵی خوڵقێنەریان ئاشنا دەکات، هەروەها پێیان دەڵێت کە ئیرادە و ویستی ئازادی ئەوان لەپێناو تاقیکردنەوەیانە لەلایەن خوداوە، تا بە هەڵبژاردن و ویستی خۆیان بیپەرستن، لەپای ئەوەش باشترین پاداشتی بۆ گوێڕایەڵان ئامادەکردووە و توندترین سزای بۆ لاسار و سەرپێچیکاران بڕیارداوە، بۆیە دەفەرموویێت: ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ [الملك: ١-٢]

واتە: «گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی کە دەسەڵاتی هەموو بوونەوەری بەدەستە، هەر ئەویشە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی دروستکردووە بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە.»

هەروەها دەفەرموویێت: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ﴾ [هود: ٧]

واتە: «هەر ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کرد و عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو، بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کامتان کردەوەتان چاکترە.» یان دەفەرموویێت: ﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾ [يونس: ٤]

واتە: «بێگومان خودا لە سەرەتاوە گشت دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان هەر خۆشی -دوای مردنیان - وەک خۆیان لێ دەکاتەوە، هەتا بە دادگەرانە پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە بڕوایان هێناوە و ئاکاریان چاک بووە، بۆ ئەوانەش کە بێباوەڕ بوو، خواردنەوەیەکی زۆر گەرم و سزایەکی سەخت و ئازاردەر هەیە»

خودای گەورە لە زۆر ئایەتی دیکەی قورئاندا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو بێنیازە لە بەندەکانی و هیچ پێویستییەکی بەوان نییە، بەو واتایەی هەرکەسێک شوێن ڕێنوێنی ئەو بکەوێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکات ئەوە سەرفرازی و قازانجی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە، ئەوانەش کە ڕێگەی گومڕایی و دوور لە خودایی دەگرنە بەر ئۆباڵی زیان و دۆڕاوییان هەر بە ئەستۆی خۆیانە.

هەروەها بیری بەندەکانی دەخاتەوە کە مەبەستێکی گەورە لەپشت بەدیهێنانیانەوە هەیە لە ناسین و جیاکاری نێوان «حەق و باتڵ» و «خێر و شەڕ «لە دەرەنجامی ئەوەش دابەشبوونی خەڵکی لەنێوانیاندا و ململانێی ئەو دوو بەرەیە کە لەمەوە باشترین نموونەی کەماڵی بوونەوەر و خراپترینیان دەردەکەوێت، لەمەشدا گەورەترین نیشانەی کەماڵی بێهاوتای خودا دەبینین کە باشترینی بوونەوەران بە هەڵبژاردن و دڵخوازی خۆیان ملکەچ و فەرمانبەرداری دەبن.

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ١٦ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٧ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌۚ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾ [الأنبياء: ١٦-١٨]

واتە: «ئێمە ئاسمان و زەوی و هەرچیش لە نێوانیاندایە بە گاڵتە بەبێ مەبەست دروستمان نەکردوون، ئەگەر بمانویستایە یاری و گەمەیەک بسازێنین، لەلایەن خۆمانەوە دەمانسازاند، ئەگەر بڕیار بێت کاری وا بکەین، نا ئەوە دەستووری ئێمە نییە بەڵکوو دەمانەوێت حەق بماڵین بەسەر باتڵ و ناحەقیدا و داغانی بکەین و باتڵ نابوودبێت و تێدابچێت، هاوار و تیاچوون بۆ ئێوەش بێباوەڕان بۆ ئەو درۆ و بوختانانەی لەمەڕ خوداوە دەیکەن.»

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا

تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾ [المؤمنون: ١١٥-١١٦]

واتە: «ئایا پێتان وابوو ئێوەمان بە گەمە و بێهوودە دروستکردووە و قەتیش بۆلای ئێمە ناگەڕێنەوە بۆ سزا و پاداشت؟ بەرزی و بڵندی هەر بۆ خودای پاشا و فەرمانڕەوای حەقە، هیچ پەرستراوێکی حەق جگە لەو زاتە نییە، کە پەروەردگاری عەرشی بەڕێز و بەرزە»

لە جێیەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى﴾ [القيامة: ٣٦]

واتە: «ئایا مرۆڤ وادەزانێت کە هەروا وازی لێ دەهێنرێت و لێپرسینەوەی نابێت؟»

شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە لێک دانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت:

«(سُدیٰ) کەسێکە کە داوای ئەنجامدانی هیچ کارێک و دوورکەوتنەوە لە هیچ کارێکی لێ نەکرابێت.»

پاشان لە سوورەتی) الذاريات)، خودای گەورە زۆر بەڕوونی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ [الذاريات: ٥٦]

واتە: «من جنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.»

لە ئایەتێکی دیکەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةًۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَۚ وَلِذَٰلِكَ﴾ [هود: ١١٨-١١٩]

واتە: «ئەگەر پەروەردگارت ویستبا، هەموو خەڵکی دونیای دەکردە یەک ئوممەت و یەک کۆمەڵ، بەڵام ئەوان بەردەوام هەر ناکۆک و جیاواز

دەبن، مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتییەوە، هەر لەبەرئەوەش دروستی کردوون «.

کەواتە ئامانجی بوونمان بریتییە لە:

- ناسینی خودای گەورە

- خۆویستانە ڕۆیشتن ڕووەو خودا

- پاداشتدانەوەی چاکەکاران بە مەزنترین بەخشش

- بوونی ڕاستی و پووچی (حەق و باتڵ) لەپێناو تاقیکردنەوە و پاڵفتەکردنی باشترینی دروستکراوەکان و دوورخستنەوە و سزادانی بەدکارترینیان.

- دەرکەوتنی کاریگەری سیفەتە بەرز و جوانەکانی خودای گەورە لە دروستکراوەکانیدا لە زانست و کارامەیی خەڵق و حیکمەت و دەسەڵات و شکۆ و میهرەبانی و... هتد بێئەوەی هیچ پێویستییەکی بەوان هەبێت.

- ئەمانە هەندێکن لەوەی بۆ ئێمە ئاشکرایە لە حیکمەت و ئامانجی بوونمان، هیچ کەسێکیش نییە پەی بە هەموو حیکمەت و مەبەستی خودا ببات و پرسیار ناکرێت لەوەی دەیکات، خۆشی زاناترینە بە تەواوی حیکمەتی، کاری ئێمە تەقەلای تێگەیشتنە لەو حیکمەتانەی خودا خۆی پێی ڕاگەیاندووین وێڕای بێنیازی ئەو لە ئێمە و تێگەیشتن و پەرستشمان.

## سەلماندنی پێغەمبەرتی موحەممەد و ڕاستییەتی قورئان

ڕێگەکانی تانەدان لە پەیامبەرێتی هەڵبژاردەی خودا «موحەممەد» چەندین جۆر و شێواز لەخۆ دەگرن، لەپێناو بە درۆ خستنەوەی پەیامەکەیدا گومانگەلی جیاواز و دژیەک دەورووژێنرێن، دژبەرانی ئەم پەیامە بەدرێژایی چواردە سەدە هەوڵی بێوچان و لێبڕاوانەیان دا تا بیسەلمێنن کە موحەممەد ئەم قورئانەی لەلای خوداوە نەهێناوە، هەرگیز سەرکەوتووش نەبوون.

دوای ئەوەی کە شارەزایانی زمانی عەرەبی لەوان دەستەوسان و سەرسامی مانەوە لەئاست گەورەیی قورئان و ڕەوانبێژی و پاراوییەکەییدا، ناکۆکییان تێکەوت لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارە «کەواتە موحەممەد ئەم قورئانەی لە کوێوە هێناوە؟ » دەمێک گوتیان: «ئەو جادووگەرێکە و شەیتانەکان بۆی دەنێرن.» لە وەڵامدا خودا پێی فەرموون: ﴿هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ۝٢٢١ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ۝٢٢٢﴾ [الشعراء: ٢٢١-٢٢٢]

واتە: «هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی بوختانچی و گوناهکار.»

ئەوان دەیانزانی کە پێغەمبەر ناڕاستبێژ و قسە هەڵبەست و بەدڕەفتار نییە، چونکە هەر دوێنێ بوو سەری زمان و بنی زمانیان باسی ڕاستگۆیی و دەستپاکی موحەممەد بوو.

تاوێکیش دەیانگوت: «کەسێک هەیە ئەمانەی فێردەکات.» کەچی لەناو هەموو زمانپاراو و ڕەوانبێژانی عەرەب کەسیان نەدۆزییەوە قورئان

بدەنە پاڵی، هاتن دایانە پاڵ ئاسنگەرێکی ڕۆمی عەجەمی[1] لە مەککە، وا گومانیان برد کە ئەو مامۆستای پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێت) و ئەمانەی فێردەکات، لە وەڵامی ئەمەشدا خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ١٠٣﴾ [النحل: ١٠٣]

واتە: «سوێندبێت ئەمەش چاک دەزانین کە ئەوانە پێت دەڵێن: هەر ئادەمییەکە ئەم قورئانەی فێردەکات، مەبەستیان لە کابرایەکی ڕۆمی بوو، خۆ زمانی ئەو کەسەی ئەوان نیازیانە قورئان بدەنە پاڵی عەجەمییە و ئەم قورئانەش بە زمانێکی عەرەبی پاراو و ڕوونە.»

لەدوای ئەوانیش کەسانێک هاتن گوتیان: «موحەممەد قسە و باسەکانی ناو قورئانی لە پەڕتووکە پیرۆزەکانی پێش خۆیەوە دەرهێناوە.» ئەمەش دوای ئەوەی تێبینی هەندێک لێکچوونیان کردبوو لەنێوان بەسەرهاتەکانی قورئان و ئەو چیرۆکانەی لە تەورات و ئینجیلدا هەن، بەڵام بێئاگا بوون لە چەند ڕاستییەک کە دەیسەلمێنن ئەم گومانەیان نیشانەی مایەپووچی دەسەوسانییانە لە ئاست حەق و کاریگەرییە بەهێزەکەی.

چونکە لەڕاستییدا ئەو لێکچوونە کە لەگەڵ بەشە ڕاست و دەستکاری نەکراوەکانی ئەو چیرۆکانەدا هەیە، بەڵگەیەکی دووپاتکەرەوەی ڕاستگۆیی پێغەمبەرە نەک پێچەوانەکەی، مانای ئەوەیە کە پێغەمبەر ئەو بەسەرهاتە ڕاستانەی تەنیا لە ڕێگەی وەحییەوە پێ گەیشتووە، چونکە ئەو نەخوێندەوار بوو و نەیدەتوانی پەڕتووکە پیرۆزەکان بخوێنێتەوە، هیچکام لەو پەڕتووکانەش لەو سەردەمەدا وەرنەگێڕدرابوون بۆ سەر زمانی عەرەبی، سەرەڕای ئەوەی قەشەکان دەستنووسەکانی پەڕتووکی

---

(١) عەجەمی: بریتییە لەو کەسەی نەشارەزایە لە زمانی عەرەبی، یان کەسێکە هەر لە بنەڕەتدا عەرەب نییە.

پیرۆزییان لای خۆیان گلدەدایەوە و دوور لەدەستی خەڵکی دەیانپاراستن تا وەکوو نێوەندکار لەنێوان ئەوان و خودادا بمێننەوە.

پاشان ئەو گومانسازانە بێئاگابوون لەوەی کە بەسەرهاتەکانی قورئان لە زۆر جێگەدا جیاوازییان هەبوو لەگەڵ چیرۆکەکانی هەردوو پەڕتووکی دەستکاری کراوی پێشوو، بەم دواییانەش لێکۆڵینەوە و پشکنینە مێژووییەکان هەندێک لەو ڕاستییانەیان پشتڕاستکردەوە کە قورئانی پیرۆز پێچەوانەی پەڕتووکەکانی تر باسیان دەکات، بێت (. بە فیرعەون، لەکاتێکدا پەڕتووکی پیرۆز بە فیرعەون ناویان دەبات، کە دواتر بەڵگە مێژووییەکانیش سەلماندیان ئەو سەردەمە قۆناغی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکان نەبووە.

هەروەها قورئان گەلێک زانیاری دیکەی پێشتر نەزانراوی بۆ سەر چیرۆکەکانی پەڕتووکی پیرۆز زیادکرد کە تێیدا نەبوون، سەرەڕای ئەوەی خودای گەورە لە قورئاندا بەڕوونی ڕای دەگەیێنێت کە ئەم پەڕتووکە بەڕاست دانەر و سەلمێنەری پەڕتووکەکانی پێش خۆیەتی، کەواتە بوونی هاوچەشنی لەنێوان بەشێک لە ناوەڕۆکەکانیان، پرسێکە قورئان خۆی هەواڵی لەبارەوە داوە، نەک نەیارەکانی دۆزیبێتیانەوە.

هەرچی پەیوەندی بە تانەدانیشەوە هەیە لە خودی کەسایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت)، ئەوا پێشینەکانیان بە تۆمەتگەلێکی دژیەک و بێسەروبەر تۆمەتباریان دەکرد کە بەئاشکرا شپرزەیی و قین و هەستکردن بە بەزیوی خاوەنەکانیانی تێدا بەدی دەکرێت، پێیان دەگوت: جادووگەر، فاڵگرەوە، شاعیر، فێرکراو و... هتد، دوای ئەوان و تا ئەمڕۆش کەسانێک دێن بە چاویلکەی پڕ لە ڕق و کینەوە پەڕە پەڕەی پەڕتووکەکانی ژیاننامە و مێژوو و ئەدەب هەڵدەدەنەوە تا لە دوو توێیاندا هەڵوێستێک دەربهێنن و تانەی پێ بدەن لەو پێغەمبەرە بەڕێزە، لەپێناو گەیشتن بەو

مەبەستەشیان سووکایەتی بە هەرچی ڕێبازی زانستی باوەڕپێکراوە دەکەن، بەجۆرێک پشت لە هەموو ئەو گێڕانەوە و هەواڵانە دەکەن کە مەرجەکانی چەسپاوی و ڕاستبوونیان تێدایە و لە دەوری هەر گێڕانەوەیەکی سەنەد پچڕاو گردەخۆن کە کەسێکی نەناسراو یان بە درۆزن ناسراو گێڕابێتییەوە.

تێکڕای ئەوان پێشین و پاشینیان، خۆیان دەدزنەوە لە ڕێگا ئاشکراکەی هەوڵدان بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەم پەیامە کە خودای باڵادەست خۆی بانگهێشتیان دەکات بۆی و دەفەرموویێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ [البقرة ٢٣-٢٤]

واتە: «جا ئەگەر ئێوە لە گوماندان لەم قورئانەی ناردوومانەتە سەر بەندەی خۆمان موحەممەد، دەی سوورەتێک بێنن بە وێنەی ئەو و هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خودا بانگ بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن و بە فەرموودەی خودای نازانن، خۆ ئەگەر ئەمەتان نەکرد و هەرگیز ناشتوانن بیکەن، دە سا وەرن باوەڕ بێنن و خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی سووتەمەنییەکەی خەڵک و بەردە و بۆ بێبڕوایان ئامادەکراوە.»

یان لێرەدا کە دەستەوسانیان ڕادەگەیەنێت و دەفەرموویێت: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ [الإسراء: ٨٨]

واتە: «ئەی موحەممەد بڵێ: سوێند بەخودا ئەگەر هەموو مرۆڤ و جن کۆ ببنەوە بۆئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، ناتوانن وێنەی ئەو بهێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.»

ئەم ئایەتە لە کاتێکدا دابەزی کە قوڕەیش ئامادەبوو دەستبەرداری

هەموو گەنجینە و سامانی ببێت لەپێناو شکستهێنان بە پێغەمبەر لەو دەمەی کاڵای ڕەوانبێژی لە سەرتۆپی بایەخ و فرۆشییدا بوو، لە دەرەوەی مەککەش زۆرینەی عەرەب لە چاوەڕێی دەرفەتێکدا بۆ زیانگەیاندن بە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێت.) خۆیان مەڵاس دابوو، سووربوون لەسەر لەدژوەستانەوە و شکستپێهێنانی، وەک چۆن لە جەنگی ئەحزابدا هەوڵێکی وایان دا، کەواتە ئەمانە چییانە وا هەموو سەرسام و دەستەپاچە ماون لە بەرانبەر ئەم یەخانگیرییە؟»

مەگەر کۆبوونەوە و یەکخستنی هەوڵەکانیان بۆ هێنانە کایەی دەقێکی هاوشێوەی ئەم قورئانە ئاسانتر نەبوو بۆیان لەو جەنگانەی لەگەڵ پێغەمبەردا هەڵیانگیرساند؟

چما شکۆ و فیزی ئەوان کە سەرانی عەرەب بوون وای لێ نەکردن لەئاست ئەم یەخانگیرییەی بەرانبەرەکەیان بە بەرچاوی خەڵکییەوە دەستەپاچە ڕانەوەستن و بچنە گۆڕەپانی ئەو ململانێیە و هەوڵی سەرکەوتن بدەن تێیدا؟ بە تایبەت کە قورئان پێشوەختە جاڕی دۆڕان و سەرنەکەوتنی ئەوانی دابوو تێیدا، لەگەڵ ئەوەی دەستکراوەی کردبوون لە پەنابردن بۆ هەرکەسێک کە خۆیان بیانەوێت.

دکتۆر موحەممەد دەڕڕاز) ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە پەڕتووکە بەنرخەکەیدا بەناوی (النبأ العظيم) بەم جۆرە وەسفی ئەو ڕاگەیاندنە خودایییە دەکات کە لە سوورەتی بەقەڕەدا بەم وشانە دێتە پایان: ﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ﴾ [البقرة: ٢٤]

واتە: «خۆ ئەگەر ئەمەتان نەکرد و هەرگیز ناشتوانن بیکەن دە سا وەرن باوەڕ بهێنن و خۆتان بپارێزن لە ئاگر.»

هەروەها دەڵێت:

«بڕوانە چ هاندان و دەمارگرتنێکە، لەگەڵ ئەوەی بە یەکجاری و بۆ هەمیشە ڕایگەیاند (وَلَن تَفۡعَلُواْ) هەرگیز ناتوانن ئەوە بکەن، هەڕەشەشی لێکردن بە ئاگری دۆزەخ و هاوتای کردن بە بەرد، دە سا سوێند بێت ئەگەر یەکێک لەوان زمانی لەو مەیدانە گۆی بکردایە ئاوا بێدەنگ نەدەمانەوە لەکاتێکدا دوژمنی سەرسەختی بوون و لەسەر ناوبانگ و شکۆڕاگری خۆیان پێداگر بوون، قورئانیش ئەو شکۆ و شانازییەیانی خستبووە ژێر پرسیارەوە، بەڵام یەک دەرچەیان نەدۆزییەوە تا لە ڕێگەییەوە بەرهەڵستی بکەن، پەیژەیەکیشیان دەست نەکەوت بیانگەیەنێتە ئاستێک جێی پێ لێژ بکەن، بەڵکوو خۆیان لە بەرانبەر چیایەکی بەرز و بڵند بینییەوە کە نە توانییان پێیدا سەربکەون نە توانیشیان کوناوەدەری بکەن، تا بێئومێد بوون لە توانای خۆیان و دڵنیابوون لە دەستەوسانییان، هیچ وەڵامێکیان پێ نەما جگە لەوەی سوار ئەسپی کەللە ڕەقی بوون و لە گۆڕەپانی ململانێی وشە و گوفتار شمشێرەکانیان هێنایە گۆ، ئەوەش تەنیا گەڕ و فێڵی گشت دۆڕاوەکانی مەیدانی بەڵگەکارییە و لەتاو دەستەپاچەیی زمان و قەڵەمیان پەنای بۆ دەبەن.

سەردەمی دابەزینی قورئانیش تێپەڕی و ئەم جاڕی مەیدانخوازییە وەک خۆی مایەوە تا هەرکەسێک گومانی هەبوو توانای خۆی تاقیبکاتەوە، لەوکاتەی هێشتا لە سارانشینی عەرەب و ناوچەکانی دەوروبەری خەڵکانێک مابوون کە نە ڕەچەڵەکیان لەگەڵ نەتەوەکانی تر تێکەڵ بووبوون و نە زمانیان نارێکی تێ نەکەوتبوو، چێژ و توانای ڕەوانبێژیشیان گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو، تێیاندا هەبوو ئەگەر توانیبای ئەم ئایینە لە ڕیشەوە دەربهێنێت، دەیکرد تا بیسەلمێنێت ئەوەی پێشینەکانیان پێیان نەکرا لەگەڵ قورئان ئەمان دەیکەن، بەڵام ئەمانیش هەروەک پێشینانیان

نەیانتوانی و ملکەچ و دەستبەستە مانەوە لە ئاستییدا.

پاشان ڕۆژگار تێپەڕی و زمانی عەرەبیش پشتاوپشت بۆ نەوەکانی دوای ئەوان مایەوە، کەچی ئەوانەی دواتر هاتن دەستەوسانتر بوون و بەرانبەر ئەم داوا مەزنە پڕکێشی کەمتریان نواند، واتە شایەتی سەراسیمەیی و دەستەپاچەیی خۆیان بۆ سەر گەواهیدانی مێژوو لەسەر دەستەوسانی پێشینانیان زیادکرد.

هەتا ئێستاش ئەمە دۆخی نێوان خەڵک و قورئانە و تا ڕۆژی دواییش هەر وا دەمێنێتەوە.»[1]

ئەم ئاڵنگارییە قورئانییەش هەتا دونیا دونیا بێت دەمێنێتەوە، جا هەرکەس گومانێکی لە قورئان هەیە ئەوە مەیدانە با کارتی بەرز بکاتەوە و لێهاتوویی خۆی نیشان بدات، با یەک سوورەت لە چەشنی قورئان بهێنێت، خۆ ئەگەر نەیتوانی و هەرگیز ناشتوانێت، با خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت کە ڕاستەقینەیەکی حاشا هەڵنەگرە.

## هەواڵ لەبارەی نادیارەکان (غەیبیات):

گومانی تێدا نییە مرۆڤ هەرچەندە متمانەی بە زانیین و پەی بردنی خۆی هەبێت، ناتوانێت گرەو لەسەر تواناکانی ئەوانی تر بکات کە بەردەوام گۆڕان و زیاد و کەمیان بەسەردا دێت، بۆیە کاتێک هەواڵ لەبارەی شتێکەوە دەدات کە پەیوەندی بە داهاتووەوە هەیە و بەبێ پشتبەستنیش بە پێشبینییە زانستییەکان پێویستە خاڵێکی گەڕانەوەی پێشوەختە دابنێت بۆ ئەگەری بەڕاست نەگەڕانی پێشبینییەکەی، بەڵام ئەگەر کەسێک بێت

---

(1) النبأ العظيم، محمد دراز (١٠٥ - ١٠٦).

بە تەواوی متمانە و دڵنیایی بێگومانەوە لەبارەی پرسە نادیارەکان و هەواڵە شاراوەکانەوە قسە بکات، هەواڵگەلێک لە بابەتی هەمەجۆر و جیاواز لە کاتی ڕوودان و پەیوەندیدارییان، هەندێکیان سەبارەت بە گۆڕانکارییە گەردوونییەکان و ڕووداوە سیاسییەکان و بڕێکیش لەمەڕ پرسە جڤاکی و کۆمەڵایەتییەکان، هەندێکیش لەبارەی تاکەکەسەکان و چارەنووسیان دوای دەیان ساڵ لە کاتی هەواڵەکە، بەڵکوو پێداگریش بکات لەسەر ڕوودانی هەریەکە لەو پێشبینییانە بە هەموو ئەو وردەکارییانەوە کە لە هەواڵەکەدا ئاماژەی پێدراوە، هەموو ئەمانە لە دەرەوەی بازنەی تواناکانی مرۆڤن.

ئەگەر بەم ئەنجامە گەیشتیت، لەگەڵمدا لە نموونەی ئەو بەڵێن و هەواڵە نادیارانەی قورئان ڕابمێنە کە لەبارەی داهاتوو داوێتی:

**بەڵێنی یەکەم:** خودای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٥﴾ [الروم: ١-٥]

واتە: «ئەلیف، لام، میم[١]، ڕۆمەکان شکێنران و ژێرکەوتن -فارسەکان زاڵبوون بەسەریاندا-، لە نزیکترین خاکیان - لە مەککەوە یان لە وڵاتی فارسەوە-، ڕۆمەکان دوای تێکشکانیان لە داهاتوودا سەردەکەونەوە بەسەر فارسەکاندا، لەماوەی چەند ساڵێکدا، هەموو کاروبار و دەسەڵاتێک

---

(١) سەبارەت بەو پیتانەی لە سەرەتای هەندێک لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون زانایان دەڵێن ڕاستترین بۆچوون لەبارەیانەوە ئەوەیە کە تەنیا خودای گەورە خۆی حیکمەت و مەبەستەکەیان دەزانێت، لەبەرئەوەی هیچ دەقێکی قورئان یان سوننەت لەبارەیانەوە نەهاتووە. هەرچی ڕاڤەی زانایانیشە بۆ ئەم پیتانە لە چەند بۆچوونێکدا خۆی دەبینێتەوە کە بەهێزترینیان ئەمانەن: ١-: ئەم پیتانە ناون بۆ ئەو سوورەتانەی کە لە سەرەتایانەوەن، ئەمە ڕای هەندێک لە هاوەڵان و تابعینیشە. ٢- هەندێک لە ڕاڤەکارانیش دەڵێن: ئەم پیتانە بۆ دەستەوسانکردنی عەرەبە بێباوەڕەکانە کە وێڕای ڕەوانبێژی و زمانزانییان ناتوانن نموونەیەکی وەک قورئان بهێنن لەکاتێکدا هەر لەو پیتانە پێکهاتووە کە ئەوان بەکاری دەهێنن. -وەرگێڕ-

پێش سەرکەوتن و پاش سەرکەوتن هەر بۆ خودایە، لەو ڕۆژەدا کە ڕۆمەکان سەردەکەونەوە باوەڕداران خۆشحاڵ دەبن، بە سەرخستنی خودا -بۆ ڕۆمەکان-، خودا هەرکەسی بوێت سەری دەخات، هەر ئەو زاڵی میهرەبانە.»

ئەم ئایەتانە هەواڵ لەبارەی چەند ڕووداوێکی داهاتووەوە دەدەن، ئەوانیش:

**١-** هەڵگیرسانی جەنگێک لەنێوان فارس و ڕۆم

**٢-** سەرکەوتنی ڕۆم لەو جەنگەدا بەسەر فارسدا

**٣-** کاتی ڕوودانی جەنگەکە و سەرکەوتنی ڕۆم تێیدا تەنیا لە ماوەی سێ بۆ نۆ ساڵدا[1]

**٤-** هەندێک لە زانایان وای بۆ دەچن کە هەواڵدانێکی دیکەشی تێدایە بە سەرکەوتنی موسڵمانان لە هەمان ڕۆژی سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارسدا، ئەویش بە پشتبەستن بە وتەی خودای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ [الروم: ٤-٥]

واتە: «لەو ڕۆژەدا کە ڕۆمەکان سەردەکەونەوە، باوەڕداران خۆشحاڵ دەبن، بە سەرخستنی خودا.»

گومانی تێدا نییە کە ئایەتەکە باس لە دڵخۆشی ئیمانداران دەکات بە سەرکەوتن، بەڵام ڕاجیایی هەیە لەسەر مەبەست لە سەرکەوتووەکان کە موسڵمانانن یان ڕۆم.

ناپرسی دەبێت چی پاڵ بە پێغەمبەرەوە بنێت بانگەوازەکەی بخاتە ژێر

---

(١) وشەی (بضع) لە زمانی عەرەبیدا کاتێک وەک ژمارە بەکاردێت، مەبەست پێی لەنێوان سێ تا نۆ دایە. -وەرگێڕ-

ASTANA

مەترسی بەدرۆخستنەوەوە؟ ئەگەر متمانەی تەواوی نەبێت بە ڕاستی ئەو هەواڵانە و ئاوا بە دڵنیایی باس لە دەرەنجامی جەنگێک بکات کە هێشتا هەڵنەگیرساوە، لەنێوان دوو گەورەترین سوپای ئەوکاتەی جیهانیش، بگرە ماوەی ڕوودانی ئەو جەنگە گەورەیەش دیاری دەکات.

چی دەبوو ئەگەر ئەو جەنگە ڕووی نەدابایە؟

چی دەبوو ئەگەر جەنگەکە هەڵبگیرسایە، بەڵام دەرەنجامەکەی لە بەرژەوەندی فارس بووایە؟

تەنانەت ئەگەر ڕۆمیش سەربکەوتنایە، بەڵام لەپاش ئەو ماوە دیاریکراوە یان لەپێش ئەوە بیووایە؟

ئایا هەریەکێک لەم ئەگەرانە نەدەبوو بە بیانوویەک بەدەست بێباوەڕانەوە بۆ بەدرۆخستنەوە و پشت تێکردنی؟

بۆ نا، سوێند بە خودا دەبوو!

بەڵام ئەو چەند ساڵە تێنەپەڕین تا جەنگەکە لەنێوان فارس و ڕۆمدا هەڵگیرسا، بە سەرکەوتنی ڕۆمیش کۆتایی هات هەروەک لە قورئاندا هاتبوو، بەڵکوو کۆمەڵێک لە مێژووناسان وای بۆ دەچن کە ئەم ڕووداوە هاوکات بووە لەگەڵ سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی بەدر، هەموو ئەمانەش بەڵگەی زەق و ئاشکران لەسەر ئەوەی قورئان لەلای ئەو خودایەوە هاتووە کە تەنیا خۆی زانا و ئاگادارە بە نادیارەکان.

**بەڵێنی دووەم:** خودای گەورە لەبارەی هاوبەشدانەرانی قورەیشەوە دەفەرمووێت: ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ [القمر: ٤٥]

واتە: «لەمە بەدوا ئەو کۆمەڵە دەشکێنرێن و پاشەوپاش هەڵدێن و ڕادەکەن.»

ئەمەش ئایەتێکی مەککەییيە و کاتێک دابەزی کە هێشتا هیچ جەنگ و کوشتارێک لەنێوان ئەوان و موسڵمانان ڕووی نەدابوو، هەواڵێکی تێدایە لەبارەی داهاتوو کە هیچ کەس ناتوانێت بەم جۆرە گومانبڕی و بێ دوودڵییە قسەی لەسەر بکات، تەنیا زاتێک نەبێت کە زانایە بە نادیار و شاراوەکان، چونکە ئەم ئایەتە لە کاتێکدا دابەزی کە بارودۆخی موسڵمانان لەوپەڕی دژواریدا بوو لە مەککە، بەجۆرێک وشەی چەوساوە (موستەزعەفین) وەسفێکی پڕ بە پێستیان بوو، بەو پێیەی لەژێر باری چەوسانەوەیەکی ئایینی سەختی قوڕەیشدا بوون. بۆچی ئەم کۆمەڵەیە تێک ناشکێن، بەڵام گەورە هێزی قوڕەیش ڕۆژێک لە بەرانبەر ئەم چەوساوانەدا بەچۆکدا دێت و هەڵدێت؟! چۆن ئەوە ڕوودەدات؟! خۆ ئەگەر هەواڵەکە جۆرێکە لە گەشبینی و خۆزگەخوازی، بۆچی لەجیاتی ئەم جەختکردنەوەیە لە سەرکەوتن بە ڕستەیەکی گریمانەیی باسی ناکات کە بوارێک بۆ ئەگەری ڕوونەدانیشی بهێڵێتەوە.

بەڵام چەند ساڵێک تێنەپەڕی بەسەر ئەم هەواڵەدا تا هێز و شکۆی ئیسلام لە مەدینەوە دەرکەوت، دوای ئەوەی تاقمی موشریکان بەرەو مەرگی خۆیان هاتن لە بەدر، لەوێ شکستیان هێنا و پاشەکشەیان کرد، بەم جۆرە خودا بەڵێنەکەی بەجێ هێنا و سەربازانی خۆی سەرخست.

**بەڵێنی سێیەم:** خودای گەورە فەرمووی: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ [الفتح: ٢٧]

واتە: «بێگومان خودا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاست گێڕا و هێنایە دی، سوێند دەخۆم کە بە ویستی خودا دەچنە ناو مزگەوتی حەرام بەئارامی و بێ ترس عومرەی خۆتان دەکەن و سەرتان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە و ناشترسن لە هیچ کەسێک، جا ئەوەی خودا دەیزانی ئێوە نەتاندەزانی

-کە خێر لەو ڕێکەوتنەدایە- و جگە لە چوونە ناو مەککە سەرکەوتنێکی نزیکی تریشی هێنایە پێش بۆتان.

ئەم ئایەتە لە کاتی پەیمانی حودەیبیەدا دابەزی، لە ساڵی شەشەمی کۆچی و دوو بەڵێنی لەبارەی داهاتووەوە تێدایە:

١- چوونە ناو مزگەوتی حەڕام بە ئارامی و بەبێ جەنگ، لەگەڵ ئەنجامدانی عومرە.

٢- لە پێش ئەم چوونە ناوەوەیەش فەتح و سەرکەتنێکی نزیک دێتە ڕێی موسڵمانان.

دواتر هەردوو بەڵێنەکە وەک چۆن خودای گەورە هەواڵیدابوو هاتنەدی، لە ساڵی حەوتی کۆچی قەڵای خەیبەر فەتح کرا، ئەم سەرکەوتنەش بە خێر و فەڕێکی گەورە گەڕایەوە بۆ موسڵمانان، هەر لە هەمان ساڵدا پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی چوونە ناو مەککەوە، عەمرەیان بەتەواوی سوننەتە وابەستەکانی وەک سەرتاشین و قژ کورتکردنەوەوە بەبێ ترس ئەنجامدا، تا ئەمەش ببێتە بەڵگەیەکی تر کە ئەم قورئانە لەلایەن خوداوەیە .

**بەڵێنی چوارەم:** هەواڵدانی بێگومان و لەوپەڕی جەختکردنەوەدا بە سەرکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە دونیاشدا پێش دوارۆژ، وەک خودا خۆی فەرمووی: ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾ [الحج: ١٥]

پاشان با لە جوانی ڕاڤەی ئەم ئایەتە ڕابمێنین:

لە ڕاڤەی ئایەتەکەدا ڕاڤەکاری قورئان شێخ شەنقیتی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت:

«﴿مَن كَانَ﴾ واتە: هەریەکێک لە بێباوەڕان و ئیرەیی بەران بە پێغەمبەر

(ﷺ) ﴿يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ﴾ وا گومان دەبات کە خودا پێغەمبەرەکەی خۆی موحەممەد سەرناخات لە دونیا و دوارۆژدا {فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ} بۆ نایەت پەتێک بە بەرزییەوە[1] هەڵبواسێت و خۆی پێ ببەستێت، {ثُمَّ لْيَقْطَعْ} پاشان خۆی بەربداتەوە تا دەخنکێت، لە پاش ئەوە {هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ} با سەیر بکات و بزانێت بەو کارەی دڵی ئاودەخواتەوە و ئارخەیان دەبێت لە داخ و کینەی ناو دڵی لەپای سەرخستنی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە دونیا و دوارۆژدا؟ واتای ئەوەیە ئەگەر ئەو کارەش بکەن هێشتا دڵ ئاسوودە نابن لەو داخ و بوغزەی کە لەبەرانبەر سەرخستنی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی هەیانە.

کورتەی مەبەست ئەوەیە: خودا بە هەموو ئەو کەس و کۆمەڵانەی ئێرەیی بە پێغەمبەر (ﷺ) دەبەن و ئەوانەی لە هەلێک دەگەڕێن بۆ زیانپێگەیاندنی و بەوانەش کە وا گومان دەبەن پەروەردگاری سەری ناخات، دەفەرموێت: بمرن بە داخ و کینەتانەوە، ئەو بێگومان پێغەمبەری خۆی سەردەخات با ئێوەش پێتان ناخۆش بێت، ئەمە ڕاڤەی ئایەتەکە بوو لای هەریەک لە ڕاڤەکارانی پێشین: موجاهید، قەتادە، عیکریمە، (عطاء) و ئەبولجەوزا و چەندانی تریش، وەک (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا لێیانەوە دەگێڕێتەوە، ئەوەش کە زیاتر پاڵپشتی ئەم واتایە دەکات ئایەتێکی دیکەی قورئانە کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا خَلَوْا۟ عَضُّوا۟ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ۗ﴾ [آل عمران: ١١٩]

واتە: «کاتێکیش تەنیا دەبن و لێتان دوور دەکەونەوە لەبەر ڕق و داخی دڵیان، سەرپەنجەی خۆیان دەگەزن، پێیان بڵێ: بمرن بەو ڕقەتانەوە.»

---

(١) وشەی (سماء) لە زمانی عەرەبیدا دەگونجێت بۆ هەر بەرزییەکی تری بێجگە لە ئاسمانیش بەکاربێت، وەک شاعیر دەڵێت:
وقد يسمى السماء كل مرتفعوإنما الفضل حيث الشمس والقمر
واتە: ڕەنگە بە گشت بەرزییەک بوترێ ئاسمان... فەزڵیش هەر بۆ جێیەکە خۆر و مانگی لێیە.

ئەمە پوختەی ڕاڤە بەپێزەکەی شێخ موحەممەد ئەمین شەنقیتی بوو (ڕەحمەتی خودای لێ بێت (کە لە پەرتووکی (أضواء البیان)[1] دا هێناویەتی.

سەبارەت بە وادە و بەڵێنە بەدیهاتووەکانیش لەناو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و فەرموودە ڕاستەکانیدا، هێندە زۆرن کە ئەستەمە بتوانین لە دووتوێی پەڕتووکێک بەم قەبارەیەدا جێیان بکەینەوە، سەرەڕای وردەکارییە سەرسووڕهێنەرەکانی لەبارەی ڕووداو و کەسایەتییەکان، هەواڵگەلێک کە مرۆڤ سەراسیمە دەبێت لەئاستیان، وەک بەڕاستگەڕانی هەواڵی شەهیدبوونی عومەر و عوسمان (خودا لێیان ڕازی بێت.) وێڕای ئەوەی خەلیفە و فەرمانڕەوای دەوڵەتێکی گەورە و فراوان بوون، هەواڵدان بەوەی عەمماری کوڕی یاسر (خودا لێی ڕازی بێت.) لەلایەن کۆمەڵێکی یاخیبووەوە دەکوژرێت، هەواڵدان بەوەی حەسەنی کوڕی عەلی (خودا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت.) دەبێتە هۆکاری ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی موسڵمانان یان هەواڵدان بە سەرهەڵدانی «خەواریج »، هەواڵدان بەوەی فاتیمەی کچی (خودا لێی ڕازی بێت.) یەکەم کەس دەبێت لە بنەماڵەکەی کە پاش ئەو دونیا بە جێ دەهێڵێت، ئەمانە و چەندان وادە و هەواڵی تری ڕاست و بەدیهاتوو.

## لە نێوان ڕاستگۆترینی ڕاستگۆیان و درۆزنترینی درۆزنان

ئیبن ئەبی عیززی حەنەفی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) وتەیەکی جوانی نووسیوە لە بارەی پەیامبەرێتی کە پێش ئەویش ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە ڕووی ماناوە ئاماژەی بە هەمان پرس کردووە، گوزارشتێکە عەقڵی مرۆڤ دەهەژێنێ و بیری دەبزوێنێت، لەو

---

(١) أضواء البیان (٥/ ٥٢-٥٥).

کاتەوەی بینیومە حەزدەکەم لە هەرجێیەک کە باس لە بەڵگەکانی پەیامبەرێتی موحەممەد دەکرێت، ئاماژەی پێ بدەم، ئەو دەڵێت:

«لە ڕاستییدا ئەو کەسەی بانگەشەی پەیامبەرێتی دەکات لە دوو جۆرە مرۆڤ بەدەر نییە، یان ڕاستگۆترینی ڕاستگۆکانە، یانیش درۆزنترینی درۆزنەکان. هیچ کەسێکیش نییە نەتوانێت ئەم دوانە لێک جیابکاتەوە، مەگەر نەزانترینی نەزانەکان بێت، بگرە نیشاندارەکانی حاڵی هەریەک لەو دوانە خۆیان گوزارشت لە حەقیقەتیان دەکات و پێیانەوە دەناسرێنەوە، سەرەڕای ئەوەی چەندین ڕێگا هەیە بۆ جیاکردنەوەی کەسی ڕاستگۆ لە درۆزن تەنانەت لە پرسەکانی بەدەر لە پەیامبەرێتی، چ بگات بە بانگەشەیەکی وەک پەیامبەرێتی!»<?>[١]

گەر لە بەڵگە ئێجگار زۆرەکانی ڕاستگۆیی موحەممەد بڕوانین، ئەوسا تێدەگەین بۆچی »عەبدوڵڵای کوڕی سەلام «لەگەڵ یەکەم بینینیدا بۆ پێغەمبەر گوتی: «عرفتُ أنّ وجهه ليس بوجه كذاب»[١]

واتە: «زانییم کە ڕووخساری ئەو ڕووخساری کەسێکی درۆزن نییە.»

ئاخر ئەو پێش ئەوەی پەیامی خودای بۆ بێت، تەمەنێک لەناو هۆزەکەییدا ژیا بوو، جگە لە بەڵگەکانی ڕاستبێژی و دەستپاکی هیچیان لێ بەدی نەکردبوو، لەناو هەموویاندا نازناوی «ڕاستگۆ و دەستپاک» تەنیا بووە کاڵای پڕ بە باڵای ئەو، هەر بۆیەش لە سەرەتای ئاشکراکردنی پەیامەکەی ئەم ڕاستییەی بەبیرهێنانەوە کە لەبارەی ڕاستگۆیی و دوور لە درۆیی پێغەمبەر)دروودی خوای لەسەر بێت.) دەیانزانی و پێی فەرموون: «أَرَأَيْتُكمْ لَوْ أَخْبَرْتُكمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ بِسَفْحِ هَذَا الْجَبَلِ، أَكنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟

---

(١) سنن الترمذي (٢٤٨٥).

قَالُوا: مَاجَرَّبْنَا عَلیْک كذِباً! قَال: فَإِنِّی نَذيرٌ لكمْ بَيْنَ يَدَیْ عَذَابٍ شَدِيدٍ»[١]

واته: «ئەگەر پێتان ڕابگەیەنم و بڵێم لەسەر ئەو کێوەوە سوارێکی زۆرتان بۆ دێت، ئایا بڕوام پێ دەکەن؟ گوتیان: تا ئێستا درۆمان لێ نەبیستوویت! ئەویش فەرمووی: دەی من بێدارکەرەوە و ترسێنەرێکم بۆ ئێوە پێش ئەوەی سزایەکی سەخت ڕووبەڕووتان ببێتەوە.»

کاتێکیش ئەبوسوفیان ڕۆیشت بۆ شام، کە ئەو کات سەرداری قوڕەیش و سەرکردەیان بوو لە دژی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت.) هێشتا موسڵمان نەبووبوو، هیرەقلی گەورەی ڕۆم بانگی کرد تا زیاتر لە هەواڵی موحەممەد ئاگادار بێت، لەبارەی چەند بابەتێکەوە پرسیاری لێ کرد لەپێناو گەیشتن بە ڕاستی بابەتەکە، لەمیانی ئەو پرسیارانەدا لێی پرسی: ”هل كنتم تتهمونه بالكذب؟»

واته: «بەر لەوە هیچ کات بە درۆکردن تۆمەتبارتان کردووە؟» ئەبوسوفیان وەڵامی دایەوە: نەخێر. پاشان هیرەقل ئەم وتە حیکمەت ئامێزەی پێ گووت: «وَسَأَلْتُک هَلْ كنْتمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ، فَذَكرْتَ أَنْ لا، فَقَدْ أَعْرِفُ أَنَّهُ لَمْ يَكنْ لِيَذَرَ الْكذِبَ عَلَى النَّاسِ وَيَكذِبَ عَلَى اللّٰهِ»[٢]

واته: «پرسیم لێت: ئایا پێش ئەوەی ئەو قسانە بکات بە درۆ تۆمەتبارتان کردووە؟ وتت: نا؛ چونکە دەزانم ناشێت ئەو کە درۆ لەگەڵ خەڵکدا نەکات، کەچی درۆ بەناو خوداوە بکات.»

یان لەو ساتەی کە خۆرگیران هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی مردنی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ، کاتێک خەڵکی گوتیان: بەهۆی مردنی ئیبراهیمەوە خۆر

---

(١) صحيح البخاري (٤٩٧١)، صحيح مسلم (٢٠٨).

(٢) صحيح البخاري (٧).

گیراوە، کاردانەوەی پێغەمبەر چۆن بوو بەرانبەر ئەم قسەیە؟

ئایا قسەکەیانی پشتڕاستکردەوە؟ یان لانی کەم بێدەنگەی لێ کرد؟

نەخێر، بەڵکوو لەناویاندا هەستایەوە تا بە وتارێک ئەو بیروباوەڕە هەڵەیە ڕاستبکاتەوە، جەختی لە مەزنی و بەشکۆیی پەروەردگاری خولقێنەر و پشت و پەنای کردەوە و فەرمووی: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللّٰهِ لايَنْكسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيَاتِه»[1]

واتە: «خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە، بۆ مردن یان ژیانی هیچ کەسێک ناگیرێن.»

پاشان ڕێنمایی کردن بۆ نوێژکردن و داوای لێخۆشبوون و ماڵبەخشین، چونکە ئەم پەیامهێنێکە لەلایەن خوداوە، خۆ ئەگەر قسەیەکی لەم جۆرە لەبارەی هەر یەکێک لە پادشا و سەرکردەکانی دونیاوە وترابایە، ئاشکرایە کە مامەڵەی لە بەرانبەر ئەم بەگەورە زانینەی خۆی و کوڕەکەی بەشێوەیەکی تر دەبوو.

لە بەڵگەکانی دیکەی ڕاستگۆیی پێغەمبەر و ڕاستی پەیامەکەی ئەوەیە کە ئەو هەموو قورئانی وەک خۆی گەیاند، لەکاتێکدا ئایەت گەلێکی لەخۆ گرتووە کە تێیدا خودای گەورە گلەیی لە پێغەمبەرەکەی دەکات، وەک لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ٣﴾ [عبس: ١-٣]

واتە: «پێغەمبەر ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد، کاتێک ئیماندارە نابیناکە هاتە لای کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم بوو، تۆ چۆن زانیت؟ بەڵکوو ئەو بیەوێت زیاتر دڵ و دەروونی خاوێن بکاتەوە.»

---

(١) صحيح البخاري (١٠٤٣)، صحيح مسلم (٩٠٢).

یاخود دەفەرموێت: ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٣]

واتە: «لەبەر چی مۆڵەتت دانێ؟ کە نەیەن بۆ غەزای تەبووک»

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ ۖ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [التحريم: ١]

واتە: «ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خودا بۆی حەڵاڵ کردوویت، دەتەوێت بەو کارە هاوسەرەکانت ڕازی بکەیت؟»

لە جێگایەکی تریش دەفەرموێت: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ [الأحزاب: ٣٧]

واتە: «لە دڵی خۆتدا شتێک دەشاریتەوە کە خودا ئاشکرای دەکات و لە قسەی خەڵک دەترسیت لەکاتێکدا خودا شیاوترە کە لێی بترسیت.»

دەسا پێم بڵێن، ئەگەر موحەممەد بەڕاستی پێغەمبەری خودا نەبووبایە ئەم ئایەتانەی دەگەیاند و ئاشکرای دەکردن؟ چی ناچاری دەکرد ئەم قسانە بکات کە لە دوای خۆی خەڵکی تا ڕۆژی دوایی بیڵێنەوە ئەگەر ئەو لەلایەن خوداوە فەرمانپێکراو نەبووایە بە گەیاندنی؟

هەروەها زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا ڕای دەگەیەنن کە پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت.) بەندەیەکی خودایە و پەیامی پەروەردگاری دەگەیەنێت، ئەو سوود و زیانی بەدەست نییە و ئاگاداری غەیب و نادیارەکان نییە، هیچ شتێکیشی لە کاروباری بەندەکانی خودا بەدەست نییە کە بیانبەخشێت یان سزایان بدات. ئەویش بەو چەشنەی فەرمانی پێ کرابوو گەیاندی، بۆیە ئەمە لە نیشانەکانی سەر ڕاستی و پەیامبەرێتییەتی.

لە نموونەی ئەو ئایەتانەش، خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ

ﭐلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨]

واتە: «تۆ هیچ شتێکت لە کاروباری بەندەکان بەدەست نییە، چ خودا تەوبەیان لێ وەربگرێت یان سزایان بدات.»

یان پێی دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ۝٢١ قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا﴾ [الجن: ٢١-٢٢]

واتە: «پێیان بڵێ؛ بەڕاستی من هیچ جۆرە زیانێک یان سوود و هیدایەتێکم بەدەست نییە، بڵێ: بەڕاستی کەسێک نییە من پەنا بدات لە خودا و جگە لەویش هیچ پەناگەیەک شک نابەم.»

لە جێگایەکی تریش دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ [الأنعام: ٥٠]

واتە: «بڵێ؛ خۆ من پێتان ناڵێم کلیلداری گەنجینەکانی خودام، ناشڵێم ئاگاداری گشت غەیب و نادیارێکم.»

هەروەها خودای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (درووودی خوای لەسەر بێت.) دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ﴾ [الأحقاف: ٩]

واتە: «بڵێ؛ من یەکەم پێغەمبەر نیم نێردرابم، ناشزانم چی بەسەر من و ئێوەش دەهێنرێت.»

یەکێکی تر لە بەڵگە و نیشانەکانی پەیامبەرێتی موحەممەد (درووودی خوای لەسەر بێت.) پاراستن و سەرخستنیەتی لەلایەن خوداوە وەک چۆن لە قورئاندا هەواڵ و بەڵێنی پێ داوە، لەگەڵ ئەوەی بەدرێژایی بیست و سێ ساڵی ژیانی پێغەمبەری خودا لە گەیاندنی ئەم پەیامە ڕووبەڕووی هەموو جۆرەکانی ئازاردان بووەوە، بەڵام هیچ کام لە دوژمنانی نەیانتوانی

بیکوژن، سەرباری هەوڵ و تەقەلای زۆری نەیارگەلی هەمەجۆر، چونکە خودای باڵادەست پێی فەرمووە: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ﴾ [المائدة: ٦٧]

واتە: «دڵنیابە خودا لە شەڕ و پیلانی خەڵکی دەتپارێزێت.»

بێگومان خودای گەورە خۆی پاراستنی ئارامی بە دڵی بەخشی و بە سەربازەکانی خۆی پشتیوانی لێ کرد، تا ئەو کاتەی بە تەواوترین شێوە پەیامەکەی گەیاند و شایەتی خودای گەورەشی لە ئاسمانەوە بۆ دابەزی کە فەرمووی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ [المائدة: ٣]

واتە: «ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاند و نیعمەت و بەخششی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازی بووم بەوەی ئیسلام ببێتە ئایین و بەرنامەتان.»

پاشان خەڵکی بەلێشاو هاتنە ناو ئایینی خوداوە و شاری مەککەش ڕزگارکرا.

ئەگەر دەتەوێت لە واتای ئەم پاراستنە خواییە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) تێبگەی، بڕوانە ماڵەکەی لە مەدینە، ئەوێ وەک قەڵا پتەوو و بەرگەگرەکانی یەهودییەکان نەبوو، چەشنی قەڵاکانی ڕۆمیش نەبوو، بەڵکوو خانوویەکی چەند ژووری کە هیچ ئێشکگر و دەرگاوانێکی نەبوو، تەنیا خوا خۆی دەیپاراست.

بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە لە ڕێگەی تابیعی بەڕێز (ثابت البنانی) یەوە کە دەڵێت: «گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک بوو لە ئافرەتێکی کەسوکاری خۆی پرسی: فڵانە ئافرەت دەناسیت؟ گوتی: بەڵێ، ئەنەس گوتی: ڕۆژێک پێغەمبەری خودا بە لای ئەو ئافرەتەدا تێپەڕی کە لەسەر گۆڕێک دەگریا، پێی فەرموو: «اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي» واتە: «لە خودا

بترسە و ئارام بگرە». ئافرەتەکەش گوتی: لێم گەڕێ، ئەوەی بەسەر من هاتووە بەسەر تۆ نەهاتووە، ئیتر پێغەمبەر بەجێی هێشت و ڕۆیشت، پاشان پیاوێکی دیکە لەوێوە ڕۆیشت و لێی پرسی: پێغەمبەری خودا چی پێ گوتیت؟ ئافرەتەکە گوتی: نەمزانی کە ئەوە، پیاوەکە گوتی: ئەوە پێغەمبەری خودا بوو، دوای ئەمە ئافرەتەکە هات بۆ بەر دەرگایماڵەکەی و هیچ پاسەوان و دەرگاوانێکی لەوێ نەبینی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سوێند بە خودا نەمناسیت، پێغەمبەر فەرمووی: «إِنَّ الصَّبْرَ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ»[١]، واتە: بەڕاستی ئارامگرتن ئەوەیە کە لە سەرەتای خورپە و کارەساتدا بێت.»

لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە لە هەموو شەڕ و خراپەیەک پەنای دەدا و لە گشت پیلان و تەڵەکەیەک دەربازی دەکرد.

لە نیشانەکانی دیکەی پەیامبەرێتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت.) ئەوەبوو کە متمانەی تەواوی بە هەموو ئەو وادە و بەڵێنانە هەبوو کە خوا پێی دەدا، بەجۆرێک لەوپەڕی نارەحەتی و سەختترین بارودۆخدا دڵپەرت و پەشۆکاو نەدەبوو، پشت و پەنای تەنیا خوای بەدیهێنەر و پشتیوانی بوو، بۆیە لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا گێڕدراوەتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە جارێکیان ئەبوبەکری صدیق(قسەی بۆ دەکرد و دەیگوت: ‹›کاتێک لە ئەشکەوتەکەدا بووین سەیری پێی بێباوەڕانم دەکرد لەسەروومانەوە دیاربوون، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت.) ئەگەر یەکێک لەوان تەماشایەکی پێیەکانی خۆی بکات لە بەر پێیەکانیدا دەمانبینێت! فەرمووی: «يا أَبَا بَكر، مَا ظَنّك بِاثْنَيْنِ اللّٰهُ ثالِثُهُمَا» واتە: «ئەی ئەبوبەکر، گومانت چییە بە دوو کەس

---

(١) صحيح البخاري (٧١٥٤).

خودا سێیەمیانە.»[١]

هەر بوخاری و موسلیم لە ڕێگەی جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی:

"لەگەڵ پێغەمبەری خودادا دەرچووین بۆ غەزا بەرەو نەجد، کاتێک پێغەمبەری خودا گەڕایەوە منیش لەگەڵی گەڕامەوە، لە دەمەو نیوەڕۆدا هاوەڵان لە دۆڵێکی نزاری پڕ درەخت پێمان گەیشتنەوە، پێغەمبەر لەوێ لایدا و خەڵکیش بەرەو سێبەری درەختەکان پەرش و بڵاوبوونەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) لەبن درەختێکی سەمورەدا وچانی دا و شمشێرەکەی بە درەختەکەدا هەڵواسی، ئیتر سەرخەوێکمان شکاند، تاوێک دواتر پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردین و ئێمەش چووین بۆلای، بینیمان کابرایەکی دەشتەکی لەلای دانیشتبوو، پێغەمبەر فەرمووی: «إنَّ هَذا اخْتَرَطَ سَيْفِي وَأنَا نَائِمٌ، فَاسْتَيْقظتُ وَهْوَ فِي يدِهِ صَلتًا، فَقَال لِي: مَنْ يَمْنَعُک مِنّي؟ قُلتُ: اللّهُ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ»[٢] واتە: «ئەم کابرایە شمشێرەکەمی لێ هەڵگرتم کاتێک خەوتبووم، کە خەبەرم بوویەوە بینیم شمشێرەکەمی بەهەڵکێشراوی بەدەستەوەیە، پێی گوتم: کێ دەتپارێزێت لە من؟ گوتم: اللّٰه، ئەوە دەیبینن ئێستا لەوێ دانیشتووە. دواى ئەوە پێغەمبەر هیچ سزایەکیشی نەدا.»

---

(١) صحيح البخاري (٤٦٦٣)، صحيح مسلم (٢٣٨١).

(٢) صحيح البخاري (٤١٣٥)، صحيح مسلم (٨٤٣).

ASTANA

## جوانییەکانی ئیسلام

زۆرجار لەبارەی جوانییەکانی ئیسلامەوە دەبیستین کە بە شێوەی زارەکی قسە دەکرێت، بەڵام ئەوەی لە هەمووان زیاتر پەی بە جوانییەکانی ئیسلام دەبات و زۆرتر هەست بە شیرینی ئیمان دەکات و چێژی لێ دەبات، تەنیا کەسێکە کە پابەندە بە ڕێنمایی و ئاکارەکانی ئیسلام لە هەڵسوکەوتییدا لەگەڵ خۆی و کەسوکار و دەر و دراوسێی، لە سەودا و مامەڵەی و تەنانەت لەکاتی تەنیاییشدا، چونکە ئیسلام لە ناخ و دەروونی ئەوانەدا وا پێوەی پابەندن و بەهاگەلێکی وەها دەچێنێت کە سنوورەکانی کات تێدەپەڕێنن و لە ویژدانی تاکەوە سەرچاوە دەگرن، گەرچی یاسایەکیش نەبێت بیانگێڕێتەوە، ئەمەش زۆر لە سوودگەرایی باڵاترە، لەوەش باڵاترە کە لە تیۆرکاری فەیلەسوف و دانایەک یان دەستەیەکی یاسادانەرەوە سەرچاوەی گرتبێت.

پابەندبوون بەم بەهایانەوە تەنانەت لە کاتی نەبوونی چاودێریش، هەستێکی پڕ لە متمانە و دڵنیایی بە مرۆڤی ئیماندار دەبەخشێت لەبارەی جوانی ئەم ئایینە مەزنەوە، چونکە کاریگەرییەکەی لەسەرخۆی دەبینێت کە ڕێگری لێ دەکات لە ستەم و دەستدرێژی و ناپاکی و خراپەکاری، لەدوای ئەوە هەرچی دەگوترێت لە تۆمەت و گومان لەمەڕ ئیسلام بۆ ئەم هیچ نرخ و بایەخێکیان نییە ،لەبەرئەوەی پێچەوانەکەیان لەلای خۆی دەبینێتەوە.

## پێگەی بەها ڕەوشتی و ئاکارییەکان لە ئیسلامدا

لە کاتێکدا ئیمان گرنگترین ئامانجە کە مرۆڤی موسڵمان لەپێناوی پاراستن و هێشتنەوەیدا دەژی، دەقەکانی شەریعەتیش دەبینیت کە دان بە باوەڕی کەسێکدا نانێن گەر پابەند نەبێت بە هەندێک لە بەها ڕەوشتییەکانی وەک ڕەفتارجوانی لە دراوسێیەتییدا، یان ئەو دەقانەی کە حەقیقەتی موسڵمانێتی کەسێک دەبەستنەوە بە خەسڵەتی بێوەیبوونی موسڵمانان لە دەست و زمانی، ئەوکات پلەوپایەی بەها ڕەوشتی و ڕەفتارییەکان لە ئیسلامدا بێنە پێش چاوت.

دکتۆر موحەممەد دەڕاز لە کۆتایی پەڕتووکەکەیدا بەناوی (دستور الأخلاق فی القرآن) ئەو ئایەتانەی قورئانی کۆکردووەتەوە کە بناغەی بەها ڕەوشتییەکان دادەنێن.

منیش لێرەدا هەندێک لە فەرمووده سەحیحەکانی پێغەمبەرم هەڵبژاردووە کە نیشانی دەدەن سوننەتی پێغەمبەر چیمان پێ دەڵێت لە بواری کاریگەریی ئیمان و باوەڕ لەسەر ڕەفتاری کەسەکە و ڕادەی پیادەکردنی بەها باڵاکان لە ژیانیدا، هاوکات هەندێک لە جوانییەکانی ئیسلاممان نیشاندەدەن، هەر دانەیەکیش لەو فەرموودانە بە ناونیشانی "لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین" دەخەمەڕوو:

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: «المُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلى أَمْوَالِهِم وَأَنْفُسِهِمْ»[1] واتە: «ئیماندار ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە سەر و ماڵیاندا لێی ئەمین بن.»

لێرەوە دروشم و بەیداخی هەندێک لەوانە دەکەوێت کە بانگەشەی ئیمانداری دەکەن، چونکە لەو دەمەی زێڕ و زیو لە ئارادایە، پێوەری ئیمان

---

(١) رواه الترمذي (٢٦٢٧) وقال: حسن صحيح.

ڕادەی پابەندبوونی کەسەکەیە بە دەستپاکییەوە.

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: پێغەمبەر سێ جار سوێندی خوارد کە ئەو کەسەی ئازاری دراوسێکەی دەدات باوەڕدار نییە، کاتێک فەرمووی: «واللّهِ لايُؤمِنُ، واللّهِ لايُؤمِنُ، واللّهِ لايُؤمِنٌ» واتە: «سوێند بە خودا باوەڕی نییە، سوێند بەخودا باوەڕی نییە، سوێند بەخودا باوەڕی نییە.» گوتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: «الّذی لايأمَنُ جارُهُ بَوائِقَهُ»[1]، «ئەو کەسەی دراوسێکەی لە شەڕ و خراپەی بێخەم نەبێت.»

ئایا دوای ئەمە هیچ گومانێک دەمێنێت لەوەی ئیمان کردار و ڕەفتاریش لەخۆ دەگرێت؟

هەر لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: «مِن شَرِّ النّاسِ يومَ القِيامَة ذا الوَجْهَيْنِ الَّذِی يأتِی هَؤلاءِ بِوَجْهٍ وهؤلاءِ بِوَجهٍ»[2] واتە: «لە خراپترینی خەڵکی لای خودا لە ڕۆژی دوایی کەسێکە کە دووڕوو بووە، ئەوەی دێتە لای ئەم کۆمەڵە بە ڕوویەک و دەچێتە لای ئەوانی تر بە ڕوویەکی تر.»

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: خۆبەکەمگری مرۆڤ بەرزدەکاتەوە و لێخۆشبوونیش ڕێز و شکۆی زیاد دەکات.[3]

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: کە بە ڕوانینێکی هاوسەنگ و دادگەرانە لە ئافرەتی بڕوادار بڕوانین، گەر ڕەوشتێکیمان پێ ناخۆش بوو ڕەوشتێکی تریمان بە دڵ دەبێت.[4]

---

(١) صحيح البخاري (٦٠١٦).

(٢)صحيح البخاري (٦٠٥٨)، صحيح مسلم (٢٥٢٦).

(٣) صحيح مسلم (٢٥٨٨) بمعناه.

(٤)صحيح مسلم (١٤٦٩).

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: بەرگریکردن لە ماڵ و سامانێک کە لەڕێگەی حەڵاڵەوە بەدەستهاتبێت شەرەف و شکۆمەندییە، ئەگەر مرۆڤی بڕوادار لەپێناو بەرگری لێ کردنیدا بمرێت شەهیدە.[١]

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: نابێت باوەڕدار ساویلکە و هەڵخەڵەتاو بێت، چونکە پێغەمبەر دەفەرمووێت: ((لايَلْدَغُ المُؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ واحِدٍ مَرَّتَيْن))[٢] واتە: «ئیماندار دوو جار لە یەک کونەوە ناگەزرێت.» هەر لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: قەبارەی ئەو بەرپرسیارێتییە بزانین کە دەکەوێتە ئەستۆی تاک بەرانبەر ئەو سنووربەزێنییانەی لە کۆمەڵگادا ڕوودەدەن (جا سنووربەزێنەکە هەر کەسێک بێت)، چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: «مَثلُ القَائِمِ عَلى حُدُودِ اللّهِ والْوَاقِعِ فِيهَا كمَثَلِ قَومٍ اسْتَهَمُوا عَلى سَفِينَةٍ، فَأَصَابَ بَعْضُهُم أعْلاهَا، وَبعْضُهُم أسْفَلهَا، فَكانَ الَّذِينَ فِى أسْفَلِهَا إذَا اسْتَقَوْا مِنَ المَاءِ، مَرُّوا عَلى مَنْ فَوْقَهُم، فَقَالُوا: لوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِى نَصِيبِنَا خَرْقاً وَلمْ نُؤذِ مَنْ فَوْقَنا، فَإِنْ يَتْرُكوهُم وَمَا أَرَادوا هَلكوا جَمِيعاً، وَإِنْ أَخَذُوا عَلى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعاً»[٣]

واتە: «نموونەی کەسێک کە سنوورەکانی خودا بەجێ دەگەیەنێت، فەرمان بە چاکە دەکات و ڕێگری لە خراپە دەکات، لە گەڵ کەسێک کەوتووەتە ناو بەزاندنی ئەو سنوورانەوە وەک سەرنیشانی ناو کەشتییەکن، کە دوای تیروپشک بۆ دابەشکردنی جێگەکانی کەشتییەکە، هەندێکیان سەرەوەی کەشتییەکەیان بەرکەوتووە و هەندێکیان خوارەوەی، پاشان سەرنشینەکانی خوارەوە کاتێک پێویستیان بە ئاو بێت دەبێت سەربکەون بۆلای ئەوانەی سەرەوەی کەشتییەکە، بۆیە دەڵێن ئەگەر ئێمە لە

---

(١)صحيح البخاري (٢٤٨٠)، صحيح مسلم (١٤١).
(٢)صحيح البخاري (٦١٣٣)، صحيح مسلم (٢٩٩٨).
(٣)صحيح البخاري (٢٤٣٩).

بەشەکەی خۆماندا کونێک بکەینە کەشتییەکە و چیتر ئەوانەی سەرەوە وەڕس نەکەین، جا ئەگەر ئەوانیش وازیان لێ بهێنن و ڕێگری نەکەن لەو کارەی دەیانەوێت بیکەن هەموویان تیا دەچن، خۆ ئەگەر دەستیان بگرن و ڕێگرییان لێ بکەن، خۆیان و ئەوانیش هەموو ڕزگاریان دەبێت.»

ئەم فەرموودەیە کۆمەڵگا بە کەشتییەک وێنا دەکات کە ئەستەمە بگات بە ئامانجی، بەبێ هاوکاریکردن لە پاراستنیدا و بەبێ هەماهەنگی لەسەر ڕێگەنەدان بە نقومکردنی لەلایەن کەسانی بەرژەوەندخواز و خۆبین، ئەوەش بەهۆی گێلێتی و کورتبینییان کە وایان لێ دەکات بەرژەوەندییەکانی خۆیان پێش بەرژەوەندی گشت کۆمەڵگا بخەن.

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: گرنگی بە جوان ڕاگرتنی شێوە و سەر و سیمامان بدەین، چونکە «إنَّ اللَّهَ جَميلٌ يُحِبُّ الجَمَال»[١]واتە: «خودا جوانە و جوانییشی خۆشدەوێت.» هەروەها بە بۆنخۆش هێشتنەوەی ناو دەم، چونکە «السِّواك مَطهَرَةٌ لِلفَمِ مَرْضاة لِلرَّبِّ»[٢] واتە: «سیواک پاککەرەوەیە بۆ دەم و هۆکاری ڕەزامەندی پەروەردگاریشە.»

لە فەرموودەی سەحیحەوە فێربووین: گومانی باش بە یەکتر ببەین، چونکە «الظَن أَكْذَبُ الحَدِيث»[٣] «گومانی خراپ درۆترین قسەیە.»

هەروەها فێربووین: کە لەسەر بنەمای ڕواڵەت و ئەوەی دەیبینین مامەڵە لەگەڵ خەڵک بکەین و نەکەوینە شیکاری نییەتی نێو دڵیان، وەک پێغەمبەر بە یەکێک لە هاوەڵانی فەرموو: «أَشَقَقْتَ عَنْ قَلبِهِ؟»[٤] واتە: «مەگەر دڵیت لەتکرد تا بزانیت مەبەستی چییە؟»

---

(١)صحيح مسلم (٩١).

(٢)سنن النسائي (٥).

(٣)صحيح البخاري (٥١٤٣).

(٤)صحيح مسلم (٩٦).

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: پلەوپایەی ئافرەتی موسڵمان لە ئاستێکدایە شایانی ئەوە بێت پێغەمبەری خودا لە ڕۆژێکدا کە زۆرترین ژمارەی خەڵک لە ژیانیدا لە حاجیماڵئاوایی لە دەوری ئامادەبوون، بە ڕاسپاردەی تایبەت بفەرمووێت: «اتَّقُوا اللَّهَ فِی النِّسَاءِ»[1] واتە: «لەخواترس بن لە مامەڵەتان لەگەڵ ئافرەتاندا.»

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: پێویستە ڕەچاوی هەستی ئەو کەسانە بکەین کە لە هەمان شوێن لەگەڵمان دانیشتوون، «فَلا یَناجَی اثنَان دُونَ الثالِث»[2] واتە: «با دوو کەس پێکەوە چرپە نەکەن بەبێ سێیەمیان.»

لە فەرموودە سەحیحەکانەوە فێربووین: گیانی ئومێد و چاکەکاری بڵاوبکەینەوە لە بەرانبەر ئەو کەسانەدا کە هەڵەیان کردووە و هەلی قەرەبووکردنەوەیان نیشانبدەین، بە چەشنی مامەڵەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت.) لەو کاتەی کەسێک هاتە خزمەتی و دانی بەوە دانا کە کەوتووەتە هەڵەی ماچێک کە حەڵال نەبووە بۆی، ئەویش بەم وتەیەی خودای میهرەبان دواندی کە دەفەرمووێت: {إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ} [هود: ١١٤] واتە: «بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە خراپەکان لادەبات و گوناهەکان دەشۆنەوە.»[3]

فەرموودە سەحیحەکان ئەمانەیان فێرکردین: ڕێز و پلەوپایەی دایک و باوک، گرنگی پەیوەندی خزمایەتی، مافی دراوسێ، تەنانەت وەفاداری بۆ دۆست و هاوڕێکانی باوک لەدوای مردنیشیان، وەک لە فەرموودەی

---

(١)صحیح مسلم (١٢١٨).

(٢)صحیح البخاري (٦٢٩٠).

(٣)صحیح البخاري (٤٦٨٧).

سەحیحدا هەیە «إنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلةُ الرَّجُلِ أَهْل وُدِّ أبِيهِ»[١] واتە: «لە چاکترینی کارە چاکەکان دۆستایەتی و سەردانیکردنی مرۆڤە بۆ ئەو کەسانەی دۆستی باوکی بوون.»

لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت.) فێربووین: بەشەرمبوون لە جوانترین خەسڵەتەکانە کە دەشێت لە مرۆڤدا هەبێت، بەڵام لە بەرانبەردا نابێت ئەم سیفەتە ڕێگری لە خاوەنەکەی بکات لە گوتنی حەق و کارپێکردنی و ڕاگەیاندنی، خۆ پێغەمبەر وەسف دەکرا بەوەی «أَشَدُّ حياءً مِنَ العَذْراءِ فِی خدْرِهَا»[٢] واتە: «بە شەرمتر بوو لە کچێک لە نێو پەردەکەیدا.» لەگەڵ ئەوەشدا لەپێش چاوی هەموو قوڕەیش بەسەر کێوی سەفادا سەرکەوت بۆ گوتنی حەق و فەرمووی: «إنّي نَذيرٌ لكم بَينَ يدَی عَذابٍ شَديدٍ»[٣] واتە: «من ترسێنەرێکم بۆتان بەر لەوەی سزایەکی سەخت ڕووبەڕووتان ببێتەوە.» تەنانەت هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکیان نەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) بانگەوازی تێدا نەکات بۆ ڕێگا و ئایینی خودای پەروەردگاری.

هەر لە فەرموودەی سەحیحەوە فێربووین: «شَرَّ مَا فِي رَجُلٍ شُحٌّ هَالِعٌ وَجُبْنٌ خَالِعٌ»[٤] واتە: «خراپترین دوو سیفەت لە پیاوێکدا هەبن بریتیین لە: ڕەزیلییەکی شپرزەکەر، هەمیشە پرتە و بۆڵەی بێت، هەروەها ترسنۆکییەکی دڵلەرزێن کە خاوەنەکەی وەختە دڵی دەربێت لەتاو لاوازی و تێکشکاوی و ناتوانێت هەستێت بە بەرپاکردنی حەق و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و تێکۆشان لەپێناوی خودا.»

---

(١)صحيح مسلم (٢٥٥٢).

(٢) صحيح البخاري (٣٥٦٢).

(٣) صحيح البخاري (٤٧٧٠).

(٤) سنن أبي داود (٢٥١١).

لێرەدا ناتوانین بەم پوختەکارییە مافی تەنانەت دە یەکی ئەو بەهایانە بدەین کە دەکرێت چ وەک تاک و چ وەک کۆمەڵگاش لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە فێریان بین، نامە گەلێک لە هزر و مەنهەج و تێگەیشتن و یاسا و ئاداب و ڕەوشت کە گەورەیی و جوانی ئەم دینەمان نیشاندەدەن.

ئەمەش سەرباری ئەو ژمارە زۆرەی پەڕتووک و توێژینەوە و نامەی ئەکادیمی کە لەو بوارەدا نووسراون، تەنانەت توێژینەوەگەلی دوور و درێژیان تێدایە تەنیا لە جوانییەکانی بوارێک لە بوارەکانی شەریعەتی ئیسلامی کۆڵیوەتەوە ،بە نموونە بواری جەنگ، هەروەک منیش لە پەڕتووکەکەمدا بە ناوی (نظرات منهجية في محاسن الإسلام) ئاماژەم بە کۆمەڵێک پەڕتووک و توێژینەوە داوە لەبارەی جوانییەکانی ئیسلام، کە بەپێی شێوازی نووسین و بابەتەکانیان پۆلێنکراون، دەتوانن بۆ زیاتر سوودبینین بگەڕێنەوە سەری.

بەر لەوەی پرسی جوانییەکانی ئیسلام تێپەڕێنین بەرەو بابەتی دواتر، پێم باشە چەند کورتە باسێک لە پەڕتووکی (نظرات منهجية في محاسن الإسلام) وەربگرین، وەک تەواوکاری و خستنەسەرێک لەبارەی هەندێک لایەنی مەنهەجییەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێ نەداوە.

لەڕاستییدا ئیسلام لە گشت ئایینەکانی دیکەی ئەمڕۆ بەوە جیادەکرێتەوە کە خاوەنی بیروباوەڕێکی ڕوونە لەبارەی «خودا» بە تەواوی کەماڵ و سیفاتی پەیوەند بەو زاتەوە، لەبەرئەوەشە عەقڵ هیچ ماندووبوونێک نابینێت لە قەبووڵکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی خودای گەورە و بێهاوتا، پێچەوانەی ئەو خوڕافە و ئەفسانانەی لە بیروبۆچوونی زۆرێک لە مرۆڤەکاندا هەبوون و هەن لەبارەی خودا، هەروەها ئەم پرسە لە دیارترین پرسەکانی ئایینی ئیسلامە و بەڵگەهێنانەوە لەسەری کۆششێکی ئەوتۆ ناخوازێت، چونکە قورئان لە سەرەتایەوە تا کۆتایی باس لە بەشکۆیی و

گەورەیی و بەرزڕاگری خودایە، ئەو سوورەتەش کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) هەواڵی داوە بەوەی گەورەترین سوورەتە لە قورئاندا، سەرەتاکەی هەر ستایشی خودایە و دانپێدانانە بەوەی پەروەردگاری جیهانیانە، خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە، پاشان پەیوەندی نێوان مرۆڤی بەدیهێنراو و خودای بەدیهێنەر ڕووندەکاتەوە لەگەڵ بەگەورەزانینێکی شایستە بە خوڵقێنەر، کە تەنیا بەندایەتی و پەرستشی ئەو بکرێت، هەر لە ئەویش داوای یارمەتی و پشتیوانی بکرێت، ئەمە گەورەترین سوورەتی قورئانە.

بە هەمان شێوە گەورەترین و بەڕێزترین ئایەت لە قورئاندا، لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەویش هەر لەبارەی خوداوەیە، کە ئایەتی کورسییە (آية الكرسي)، ئەو بەگەورە ڕاگرتنەی خوداش کە لە (آية الكرسي)دا هەیە لەلای هیچ کام لە ئوممەت و گەلە ئاییندارەکانی دیکە وێنەی نییە.

پاشان لە پێغەمبەرەوە بە سەحیحی گێڕدراوەتەوە کە لە قورئاندا سوورەتێک هەیە هاوتای سێیەکی قورئانە، ئەویش سوورەتی ئیخلاسە، کاتێک لەم سوورەتەش ورد دەبینەوە دەبینین کە تێکڕای سوورەتەکە بە گەورەدانان و پاک و بێخەوش ڕاگرتنی خودای بەرز و بێهاوتایە.

لە هەمان کاتدا ئەگەر سەیرێکی ئەو دەق و وەسفانە بکەیت کە لە گشت ئایینەکانی تردا لەبارەی خودای بەدیهێنەرەوە هەن، پێویستت بە هەوڵێکی زۆر نییە تا درک بە جیاوازی نێوان ئیسلام و ئەوان بکەیت، بگرە هەر خودی بەراوردکاری لە نێوان ئیسلام و ئەوان لەم پرسەدا ستەمە.

هەروەها لە جوانی و تەواوی و مەزنی دیدی ئیسلام بۆ خودا ئەوەیە کە تەنیا لە ستایش و وەسفی تەواوەتی ئەودا کورتهەڵنەهاتووە، بەڵکوو ئەم وەسف و سیفەتانە بەندایەتی و ملکەچی و کڕوزانەوە بۆ خودای گەورە دەخوازن، لەم بارەیەوە فەرید ئەنساری (ڕەحمەتی خودای لێ

بێت) دەڵێت: ((کەواتە باوەڕبوون بە پەروەردگارێتی خودا (ڕبوبییەت)[١] بۆ کەسێک کە بەڕاستی و وەک خۆی ناسیبێتی، خۆشەویستی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، چونکە ئەگەر باوەڕبوون بە خودایەتی ئەو )ئولوهییەت) کە بریتییە لە خۆشەویستی و لقەکانی ترس و تکا (خەوف و ڕەجا) لەسەر بنەمای باوەڕبوون بە پەروەردگارێتی دامەزرابێت، ئەمە مانای ئەوەیە کە پەروەردگارێتی خودا سیفەتگەلێک لەخۆ دەگرێت کە دڵەکان بەرەو خۆیان کەمەندکێش دەکەن تا باوەڕ بە خودایەتی ئەو بهێنن و بیپەرستن.))[٢]

کەواتە ئەم بیروباوەڕە ئیسلامییە مەزنە لەبارەی خوداوە وێڕای ڕوونی و باڵایی و جوانییەکەی، ئەوەی جوانتری دەکات وابەستەیی باوەڕەکەیە بە پێویستی بەندایەتی و پەرستش بۆ ئەو خودایە (ﷻ).

هەروەک زانراوە لەلای زانایانی بیروباوەڕی ئیسلام، یەکێک لە گرنگترین بەڵگە قورئانییەکان لە بەرپەرچدانەوەی هاوبەشدانەراندا بەڵگەهێنانەوەیە بە یەکتاناسی پەروەردگار (تەوحیدی ڕبوبییەت) و بە کەماڵ و سیفاتە بەرزەکانی بۆ سەلماندنی یەکخوداپەرستی (تەوحیدی ئولوهییەت) کە تەنیا شیاوی زاتی ئەڵڵایە.

لە دیارترین ئەو هۆکارانەی جوانییەکانی ئیسلام دەردەخەن و لە ناخ و هزری مرۆڤدا دەیچەسپێنن ،سەیرکردنی بارودۆخی سەردەمی نەفامی و جاهیلییە، چ جاهیلییەتی پێش هاتنی ئیسلام و چ ئەو جاهیلیەتەی لەسەرەتای هاتنی ئیسلامیشدا شوێنەواری مابوو، هەروەها بینینی دیوە

---

(١) چەمکی (ڕبوبییەت) بەواتای باوەڕبوون بە تاک و تەنیایی خودای گەورە دێت لە خەلق و بەدیهێنان و خاوەندارێتی ڕەهای بوونەوەر و هەڵسووڕێنەریی کاروبارەکانیان، چەمکی (ئولوهییەت)یش واتە باوەڕبوون بە تاک و تەنیایی خودای گەورە لە شیاوێتی بۆ پەرستش وبەندایەتی بۆ کردن و بەرجەستەکردنی ئەم باوەڕە لە کار و گوفتاردا، هەروەها ناڕەوایی هەر جۆرە پەرستشێک کە بۆ جگە لەو ئەنجامبدرێت. ـوەرگێڕـ

(٢) جمالية الدين، معارج القلب إلى حياة الروح - فريد الأنصاري (٤٥).

ASTANA

چاکسازییە گەورەکەی بانگەوازی پێغەمبەر لە بەرانبەر نەفامییەکی بەربڵاو کە لە ناخ و دەروونی عەرەبدا ڕیشەی داکوتابوو، هەم لە ڕووی بیروباوەڕ و ڕەفتارەوە و هەم لە ڕووی ڕست و داب و نەریتەوە.

لە ڕاستییدا ئێمە باس لە دەرەنجامی چاکسازییەکی ئاسایی ناکەین چەشنی بەرهەمی بزاوتە چاکسازە کۆن و نوێکان، بەڵکوو باس لە حاڵەتێکی ناوازە و بێهاوتای مێژوو دەکەین، وەک چۆن یەکێک لە بەناوبانگترین مێژوونووسانی مێژووی نوێ «وڵ دیورانت» گوزارشتی لێ دەکات، ئەو وێڕای بێباوەڕی بە پەیامی پێغەمبەر )دروودی خوای لەسەر بێت.) و تانەلێدانی و بگرە گومان دروستکردنیش لەسەری، بەڵام تینی حەقیقەت ناچاری دەکات ئەم ڕاستییە دەرببڕێت، ئەویش لە پەڕتووکی «چیرۆکی شارستانێتی» کە دەڵێت: "ئەگەر گەورەیی کەسەکان بە ڕادەی کاریگەرییان لەناو خەڵکدا بپێوین، ئەوا دەڵێین: موحەممەد لە مەزنترین مەزنەکانی مێژوو بوو، ئەو ئەرکی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆحی و ڕەوشتی خەڵکێکی لە ئەستۆ گرت کە گەرما و برسێتی بیابان فڕێی دابوونە نێو شەوەزەنگی دڕندەیی، لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجەشدا بە شێوەیەک سەرکەوتوو بوو کە هیچ چاکسازێکی تر لە تەواوی مێژوودا نەیتوانیوە شان لە شانی بدات، زۆر بەدەگمەن مرۆڤێکیش دەبینین وەک ئەو بە گشت ئامانج و خەونەکانی گەیشتبێت."[١]

---

(١)قصة الحضارة (١٣/٤٧)، وەرگێڕدراوی عەرەبی پەڕتووکی (The Story of Civilization).

# بەشی دووەم:

## سەرچاوەکانی وەرگرتنی شەریعەت و هەڵوێست لەبارەیانەوە

- ملکەچی بۆ فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) (قورئان و سوننەت)
- بەڵگەیەتی سوننەت
- بەڵگەیەتی ئیجماع

## ملکەچی بۆ فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) (قورئان و سوننەت)

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ [الأحزاب: ٣٦]

واتە: «بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی بڕوادار نییە کاتێک کە خودا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری کارێکیان دا ئەوان سەرپشک بن لە کارەدا.»

تەسلیمبوون ـ ملکەچی بۆ فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەر» دەستەواژەیەکی شەرعییە و لە پەڕتووکی خوداوە وەرگیراوە، نەک داهێنراوی دەستە و کۆمەڵێک لە موسڵمانان بێت، خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ [النساء: ٦٥]

واتە: «نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت، ئەوانەی لافی باوەڕ لێدەدەن، بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر بۆ یەکلاییکردنەوەی هەر کێشە و ناکۆکییەکی نێوانیان، پاشانیش لە دەروونیاندا هەست بە هیچ بێزارییەک نەکەن بەرانبەر ئەو بڕیارەی تۆ داوتە و بەتەواوی ملکەچ و تەسلیم بن.»

خۆبەدەستەوەدان و تەسلیمبوون بە خودا و پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر بێت.) لەو هەواڵانەی پێیان داوین و لە فەرمانەکانیشیاندا بە هەمان شێوەیە، بەم پێیە:

تەسلیمبوون بە هەواڵەکانیان: بریتییە لە بەڕاستدانان و باوەڕپێبوونیان، چ ئەو هەواڵانەی لەبارەی ڕابردوون یان ئەوانەی

لەبارەی شتانێکن لە داهاتوودا ڕوودەدەن، خودای گەورە لە زۆر جێگەی قورئاندا هەواڵگەلێکمان پێ ڕادەگەیەنێت کە لەدەرەوەی سنووری هەستپێکراوەکانن و بەڕاستدانانیشیان بەشێکە لەو ئەرکە ویستراوانەی فەرمانی پێ دەکات بە بەندەکانی، چونکە خودا تەنیا کردەوەی لە ئێمە ناوێت، بەڵکوو بەڕاستدانانیشی لێمان دەوێت، هەر خۆی وەسفی بەڕاستدانەرانیش دەکات و -لەمیانی باسی پارێزکاراندا- دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ [البقرة: ٣]

واتە: «ئەوانەی باوەڕ بە پەنهان و نادیارەکان دەهێنن.»

ملکەچی و تەسلیمبوون بە فەرمانەکان: ئەویش بە قەبوڵکردن و وەرگرتنی لە دڵەوە، پاشان ملکەچبوون بۆی و کارکردن بە ناوەڕۆکەکەی، لوتکەی تەسلیمبوونیش بە فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی لەو کاتەدایە کە فەرمانەکە لەگەڵ هەوا و ئارەزووەدا تێکدەگیرێت، یان لەو فەرمانەی گەردنکەچی تەواو دەخوازێت ئەگەرچی بەڕواڵەت بەرژەوەندی بەندەشی تێدا نەبێت.

هەر لەبەر ئەمە خودای گەورە لە قورئاندا هەڵوێستی بەندەی خەلیل و خۆشەویستی خۆی ئیبراهیممان (سەلامی خودای لێ بێت.) نیشاندەدات، لەوکاتەی خودای گەورە فەرمانی پێ کرد بە سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خودای لێبێت)، ئیبراهیم گوێڕایەڵی و تەسلیمبوونی تەواوەتی نیشاندا، ئەگەرچی حیکمەت و مەبەستی پشت ئەو فەرمانەشی لا ئاشکرا نەبوو، ﴿فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ١٠٣﴾ [الصافات: ١٠٣]

«کاتێک هەردووکیان ملکەچی فەرمانی خودا بوون و ئیبراهیم ئیسماعیلی بەڕوودا خست بۆ سەربڕین، ئەوکات خودا بەرانێکی گەورەی لەجیاتی بۆ قوربانی دابەزاند.»

ASTANA

بە کەمبایەخ تەماشاکردنی پەرستشی تەسلیمبوو، نهێنی بەندایەتی بۆ خودا لە بەندە دادەماڵێت، ئەو بەندایەتییەی کە لە ڕاستییدا مانای ئازادییەتی لەم ژیانەدا، زۆرجار پرسیارگەلێک دەوروژێنرێن بە مەبەستی کەمکردنەوە لە بەهای ئەم عیبادەتەی کەزۆرینەی خەڵک لە ڕاز و نهێنی و جوانییەکەی تێنەگەیشتوون، بۆیە دەبینیت کەسانێک دەڵێن : «ئیتر چ بوارێک بۆ عەقڵ ماوەتەوە کە ئایین لەسەر بنەمای تەسلیمبوون دامەزرابێت؟» یاخود دەڵێن: «تەسلیمبوون لەم سەردەمەدا چی دەگەیەنێت جگە لە ملدان بۆ ڕا و بۆچوونی ڕاوییەکان و گوێزەرەوانی هەواڵ و گێڕانەوەکان، ئیتر هێنانە بەرباسی تەسلیمبوون لەپای چی؟» ئەمانە و چەندین پرسیارگەلی تری هاوشێوە؟

لەڕاستییدا تەسلیمبوون هەرگیز بە مانای پەکخستنی ڕۆڵی عەقڵ نایەت، بەڵکوو ئەوە خواست و پێویستی خودی عەقڵە، لەبەرئەوەی عەقڵ کاتێک بە بەڵگە و نیشانەی ڕوون ڕاستی پەیامی موحەممەدیی بۆ دەسەلمێت، واتای ئەوەیە دەیسەلمێنێت کە ئەو پەیامە لەلایەن خوداوەیە کە خاوەنی زانستی نەبڕاوە و حیکمەتی تەواوە، کە دوور لە هەڵە و کەموکورتییە، لە هەمان کاتدا عەقڵ دەرک بەوە دەکات کە تواناکانی خۆی لەوە سنووردارترە پەی بە هەموو شتێک ببات، بەم پێیە عەقڵی ساغ وا دەخوازێت کە مرۆڤی زانست و توانا سنووردار مل بۆ فەرمانی پەروەرێنی خاوەن زانست و توانا و حیکمەتی تەواو بدات، بەمەرجێک دڵنیا بێت و بۆی سەلمابێت کە ئەو فەرمانەی تەسلیمی بووە لەلایەن خودای گەورەوە هاتووە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێمان وانییە کە بەم تەسلیمبوونە ڕۆڵی عەقڵ کۆتایی دێت، بەڵکوو زۆر بواری هەمەجۆر هەن بۆ جووڵە و بەگەڕخستنی عەقڵ لەدوای تەسلیمبوونیش، لەوانە:

١- بواری تێگەیشتن و ڕامان (تەدەببور) و هەڵێنجان لە دەقەکان.

٢- بواری دەرهێنانی حیکمەت و مەبەست و هۆکارەکان لە کۆکردنەوەی دەقەکانەوە.

٣- بواری یەکخستن و کۆکردنەوە لەنێوان ئەو دەقانەی بە ڕواڵەت دژیەکن.

٤- بواری بەکارخستن و دابەزاندنی دەقەکان لەسەر واقیع و پرسە پەیوەندیدارەکان و گۆڕانکارییەکان.

ئەگەر گوزەرێک بکەین بەنێو ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت.) هەڵوێستەکانیان بەرانبەر فەرمانەکانی پێغەمبەر، ئەو کات باڵاترین نموونەکانی گوێڕایەڵی و گەردنکەچی و خۆبەدەستەوەدان دەبینین بۆ ئەو هەواڵ و فەرمانانەی لە پێغەمبەری هەڵبژاردەوە دەهاتن، تەنانەت لە کاتی تێکگیرانی ئەو فەرمانانە لەگەڵ ئارەزووی نەفس و بەرژەوەندی خەملێندراویان، تەنیا پاڵنەریشیان بۆ ئەم گوێڕایەڵییە بێوێنەیە: ئیمان و باوەڕی تەواویان بوو بەوەی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت.) پێغەمبەری خودای جیهانیانە و ڕاستگۆیە لە گەیاندنی پەیامەکەی و لە فەرمانەکانیدا، لەگەڵ خۆشەویستی تەواویان بۆی.

ئەمەش چەند ئاماژەیەکی خێرایە بۆ هەندێک لەو هەڵوێستانە:

لە ساڵی پێنجەمی کۆچی سوپایەک لە بێباوەڕان کۆبوونەوە بە ژمارەیەک کە پێشتر وێنەی نەبوو لە زۆریدا، ئەویش سوپای ئەحزاب بوو، گەمارۆی مەدینەیان دا، لە ناوەوەش جوولەکەکانی بەنو قوڕیزەپشتیوانییان لێ کردن؛ بە هۆی ئەو ناپاکییەی ئەمان لە پشتەوە کردیان ترس گەیشتە نێو ماڵی موسڵمانان، سەرباری گەمارۆی دوژمن لە دەرەوە، هاوکات لەگەڵ کەشوهەوایەکی سارد و توند.

لەم بارودۆخەدا و لە یەکێک لە شەوانی گەمارۆدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) لەناو هاوەڵانیدا هەستایەوە و فەرمووی: «مَنْ يأْتِينِى بِخَبَر القَوْمِ جَعَلهُ اللّٰهُ مَعِى يوْمَ القِيامَة؟» واتە: «کێ هەواڵی ئەو کۆمەڵەم بۆ دەهێنێ و لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ من دەبێت؟» پێغەمبەر لەو دۆخە سەختەدا دەیویست یەکێک لە هاوەڵانی دزە بکاتە نێو سەربازگەی موشریکان و هەواڵێکی بۆ بهێنێت، هەریەکێک لە هاوەڵانیش خۆزگەی دەخواست براکەی هەستێت بە ئەنجامدانی ئەم کارە، چونکە پێغەمبەر فەرمانی بە کەسێکی دیاریکراو نەکردبوو.

کاتێک بینی هیچکام لە هاوەڵان هەڵناستن، پێغەمبەر تەماشای حوزەیفەی کوڕی یەمانی کرد و فەرمووی: «قُمْ يا حُذَيْفَة» -هەستە حوزەیفە-، هەڵوێستی حوزەیفە چۆن بوو بەرانبەر ئەم فەرمانە پێغەمبەرییە؟ حوزەیفە نەهات پۆزش و بیانوو بهێنێتەوە و خاوەخاو بکات، دوودڵیش نەبوو لەوەی بە تەنیا ناوی ئەو هێنراوە، لەکاتێکدا خۆی دەڵێت من لە هەموویان هەڵبزرکاوتر و سەرمابردەتر بووم، بەڵام وتی: «فَلَمْ أَجِدْ بُدًّا إِذْ دَعَانِي بِإِسْمِى أَنْ أَقُوم» واتە: «کاتێک بە ناو بانگی منی کرد ئیتر دەبوو هەستم، بۆیە دەستبەجێ هەستا و چووە ناو سەربازگەی دوژمن، لەوەودوا چیرۆکەکەی دوورودرێژە و لە جێی خۆی ئاماژەی پێ دراوە.»[١]

**هەلوێستێکی تر:**

مەعقیلی کوڕی یەسار خوشکەکەی لە یەکێک لە هاوەڵان مارەبڕیبوو، پاشان شتێک لە نێوانیاندا ڕوویدا و جیابوونەوە، دوای ماوەیەک لەم جیابوونەوەیە ویستیان بگەڕێنەوە لای یەکتر بە ڕەزامەندی هەردووکیان،

---

(١) تەواوی چیرۆکەکە لە سەحیحی موسلیم (١٧٨٨).

بەڵام مەعقیلی کوڕی یەسار غیرەت گرتی و بە هاوەڵەکەی گوت: «خوشکەکەمم لێ مارەبڕیت و خستمە نێو ماڵەکەت و ڕێزم بۆ دانایت، کەچی تۆ تەڵاقت دا، ئێستاش هاتوویت داوای دەکەیتەوە، نا سوێند بە خودا هەرگیز ناگەڕێتەوە لات!» پاشان وتەی خودای گەورە دابەزییە خوار: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ﴾ [البقرة: ٢٣٢]

واتە: «هەروەها ئەگەر ژنانتان تەڵاقدا و گەیشتنە کۆتایی سووڕی مانگانەیان، ئێوە ، ئەی کەسوکاری ژن مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بە هاوسەرەکانیان.»

کاتێک مەعقیلی کوڕی یەسار ئەمەی بیست نەی گوت: من قسەیەکم کردووە و نایگۆڕم، پیاو ئەبێت لەسەر قسەی خۆی سوور بێت و لەم جۆرە قسانە، بەڵکوو گوتی: «الآنَ أَفْعَلُ یا رَسُولَ اللّٰهِ» - «هەر ئێستا ئەو کارە دەکەم ئەی پێغەمبەری خودا، پاشان خوشکەکەی لێ مارەبڕییەوە»[١]

**هەلوێستی سێیەم:**

هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت.) لە ساڵی حودەیبییەدا بە پەرۆشییەکی زۆرەوە بۆ ئەنجامدانی عومرە و دوای دابڕانی چەندساڵەیان لە مەککە، خۆیان ئامادەکرد و ئیحرامیان بەست، بە دەم زیکری تەلبیە و دڵی پڕ لە تاسە و ئەوینەوە بەڕێکەوتن، تا نزیکبوونەوە لەوەی بچنە ناو حەرەمی پیرۆز، موشریکان نەیانهێشت و ڕێیان لێ گرتن، دانوستانەکان درێژەی خایاند لە نێوانیاندا تا گەیشتن بە گەڵاڵەنامەیەکی چەند خاڵ و مەرجی (ڕێکەوتنی حودەیبییە)، کە هەندێک لە موسڵمانان پێیان وابوو چەند خاڵێکی ڕێکەوتنەکە نەنگی تێدایە بۆیان، واتە سەرباری ڕێگیرانیان لە

(١) چیرۆکەکە لە سەحیحی بوخاری (٤٥٢٩)

ئەنجامدانی عومرە، داخی ئەو مەرجانەش کە نەنگییان تێدا دەبینی خەمی ئەوانی دووهێندە کردبوو، هەر بەپێی ڕێککەوتنەکە دەبوو ساڵی دواتر عومرە ئەنجام بدرێت، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت.) فەرمانی پێ کردن سەریان بتاشن و ئیحرام بکەنەوە، دۆخەکە هێندە سەخت بوو تەنانەت گوتراوە: لەتاو دڵتەنگی و نیگەرانی خەریکبووە هەندێکیان هەندێکی تریان بکوژن (وەک لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە) [١] بەڵام هەر کە پێغەمبەری خودایان بینی پێشیان کەوت بە تاشینی سەری و دانانی ئیحرامەکەی، دەستبەجێ هەستان و هەموو چاویان لێ کرد، هیچکام لەوانیش نافەرمانی لێ نەبینراوە لەو ڕۆژەدا.

---

(١) صحيح البخاري (٢٧٣٢)

## بەڵگەیەتی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)

هەندێک لە خەڵکی بە جۆرێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەڕوانن وەک ئەوەی هیچ نەبێت جگە لە کۆمەڵێک ڕیوایەت و گێڕانەوەی هەڵچنراوی کەڵەکەبوو، کە ناتوانرێت هیچیان بە دڵنیایی بدرێتە پاڵ پێغەمبەر، بەڵکوو تەنیا دەتوانرێت بۆ دڵخۆشکردن سوودیان لێ ببینرێت لە هەندێک لە بوارەکانی ئاییندا، لە دەرەنجامدا ئەوان سوننەت بە سەرچاوەیەکی سەربەخۆ لە سەرچاوەکانی شەریعەت و یاسادانانی ئیسلامی نازانن.

ئەمەش پێچەوانەی بەڵگەکانی قورئان، سوننەت، کاری هاوەڵان، کۆڕای زانایان و واقیعی شەریعەتیشە.

بەڵگەکانی نێو قورئان لەسەر بەڵگەیەتی سوننەت:

سەبارەت بە قورئان، ئەوە بێگومان لێوان لێوە لە ئاڕاستەکاری و ڕێنوێنی بەرەو سوننەتی پێغەمبەر، لە نموونەی ئەوەش:

ئەو دەقە قورئانییانەی فەرمانمان پێ دەکەن بە گەڕانەوە بۆ خودا و پێغەمبەر )دروودی خوای لەسەر بێت.) لەکاتی ناکۆکی و ڕاجیایی:

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ [النساء: ٥٩] واتە: «جا ئەگەر لە شتێکدا دووبەرەکیتان هەبوو ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خودا و پێغەمبەر )دروودی خوای لەسەر بێت.»

وەک لە بەشی یەکەمی ئایەتەکە دیارە کە ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ﴾ هەموو

شتێک دەگرێتەوە، دواى ئەوە ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ مەبەست لە گەڕانەوە بۆ خودا: گەڕانەوەیە بۆ پەڕتووکەکەی کە قورئانە -ئەمەیان لای هەمووان ئاشکرایە-، بە هەمان شێوە گەڕانەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) واتە گەڕانەوە بۆ لای خودی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانیدا و بۆ لای سوننەتەکەی کە لە ژیاندا نەما، هەموو زانیانیش لەسەر ئەمە کۆکن، ئیبن حەزم) ڕەحمەتی خودای لێبێت) فەرموویەتی: «بەڵگەی ڕۆشن لەسەر مەبەستی ئەم گەڕانەوەیە تەنیا گەڕانەوەیە بۆ قورئان و هەواڵگەلێک کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە، لەبەرئەوەی هەموو ئوممەت لەسەر ئەوە کۆکن کە لەم ئایەتەدا ڕووی دواندن لە ئێمەیە و لە هەر کەسێکیش کە دەخوڵقێندرێت و ڕۆح بە جەستەیدا دەکرێت لە پەری و مرۆڤ تا ڕۆژی دوایی.»[١]

هەروەها ئیبن قەییمی جەوزی فەرموویەتی: "گشت زانایانی ئوممەت لەسەر ئەوە کۆکن کە گەڕانەوە بۆ خودا گەڕانەوەیە بۆ پەڕتووکەکەی، گەڕانەوەش بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) گەڕانەوەیە بۆ لای خودی خۆی لە ژیانیدا و بۆ لای سوننەتەکەی لەدوای وەفات."[٢]

ئەو دەقە قورئانییانەی فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی ئاشکرایان تێدایە لەسەر واجبێتی شوێنکەوتنی سوننەتەکەی، چونکە ئایەتگەلێکن تایبەت نین بە کاتی ژیانییەوە، هەرکەسێکیش بڵێت تایبەتن بەو کاتەو، تەنیا بانگەشەیەکی پێچەوانەی ڕاستی دەکات بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوەبێت.

هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە هیچ یاسا و حوکمێک تایبەت نەکراون لە یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی، بەڵکوو ئەوانیش بەشێکن لەم ئوممەتەی فەرمانی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی پێ کراوە، لەبەرئەوە

---

(١) الإحكام في أصول الأحكام - ابن حزم - دار الآفاق (٩٧/١).

(٢) إعلام الموقعين- ابن القيم – دار الجبل (٣٩/١).

حوکم و فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بە وەفاتکردنی ناگۆڕێت.

لە دەرەنجامی ڕوونکردنەوەکانی پێشووەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی، کە

شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەڕێگەی کەسانی متمانەپێکراوەوە پێمان گەیشتووە، تەنیا ڕێگەی بەجێهێنانی ئەو فەرمانانەی خودایە کە لە پەڕتووکەکەیدا هەن لەبارەی گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەیەوە، وەک شافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) فەرموویەتی: «فهل تجد السبيل إلى تأدية فرض الله -عز وجل- في اتّباع أوامر رسول الله (ﷺ)، أو أحد قبلك أو أحد بعدك، ممن لم يشاهد رسول الله (ﷺ) إلا بالخبر عن رسول الله (ﷺ) ؟»[1] واتە: "ئایا هیچ ڕێگەیەک دەدۆزیتەوە بۆ بەجێهێنانی ئەوەی خودا فەرزی کردووە لە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، یان هەرکەسێکی پێش تۆ یاخود دوای تۆ کە پێغەمبەری (ﷺ) نەبینیوە، جگە لە ڕێگەی هەواڵدان و گێڕانەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)؟"

## بەڵگەکانی نێو سوننەت:

هەرچی بەڵگەکانی خودی سوننەتیشە «هەرچەندە بەڵگە پێ هێنانەوەیان لە گفتوگۆ لەگەڵ کەسێک نکوڵی کۆی سوننەت بکات بێسوودە، چونکە ئەو سوننەت هەر بە بەڵگە نازانێت، بەڵام زانینی ئەم فەرموودانە و ئاگاداربوون لێیان پێویستە لە ڕوویەکی دیاریکراوەوە، ئەویش کاتێک کە ئەو کەسە بە هەندێک لە سوننەت بەڵگەی بۆ نکوڵییەکەی هێنایەوە، ئەوکات داوای لێ دەکەین هەموو ئەو فەرموودانە ببینێت کە باوەڕمان پێیەتی، نەوەک بێت دەستەبژێری چەند فەرموودەیەک بکات و ئەوانی تر فەرامۆش بکات.»

---

(١)جماع العلم، للشافعي، مكتبة ابن تيمية (لا ٢١-٢٢).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: «لا أُلْفَيَنَّ أَحَدَكمْ مُتَّكئاً عَلى أَرِيكتِهِ، يَأتِيهِ الأَمْرُ مِنْ أَمْرِي مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ، وَنَهَيْتُ عَنْهُ، فَيَقُول: لا نَدْرِي، مَا وَجَدْنَا فِي كتَابِ اللّٰهِ اتَّبَعْنَاهُ»[١]

واتە: «نەکەن یەکێک لە ئێوە ببینم لەسەر قەنەفەنەرمەکەی شانی دادابێت، یەکێک لە فەرمانەکانی منی بۆ بێت کە فەرمانم پێ کردووە یان قەدەغەم کردووە، بڵێت: نازانین، هەرچی لە پەڕتووکی خودا بینیمان شوێن ئەوە دەکەوین.»

ئەمەش فەرموودەیەکە شافیعی لە پەڕتووکی ڕیسالە (الرسالة) دا گێڕاویەتییەوە، هەروەها زیاتر لە یەکێک لە خاوەنی سونەنەکانیش، بە ڕشتەیەکی ساغ لە ڕێگەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوڕافیع و ئەویش لە باوکییەوە کە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) گێڕاویەتییەوە.[٢]

ئەم فەرموودەیەش دەقێکی ئاشکرا و پابەندکارە لەو پرسەدا و بەڵگەیە لەسەر واجبێتی قەبوڵکردن و کارکردن بەوەی زیاد لە قورئانیش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دێت.

هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە لە ڕێگەی میقدامی کوڕی مەعدی کەریبیشەوە (خودا لێی ڕازی بێت.) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «أَلا هَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الحَدِيثُ عَنِّي وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكتِهِ، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكمْ كتَابُ اللّٰهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَلالاً اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَرَامًا حَرَّمْنَاهُ، وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللّٰهِ كمَا حَرَّمَ اللّٰهُ»[٣]

واتە: «نزیکە پیاوی وا هەبێت فەرموودەی منی پێ بگات لەکاتێکدا

---

(١)الرسالة، للشافعي، دار الوفاء (٤٠).

(٢)سنن الترمذي (٢٦٦٣)، سنن أبي داود (٤٦٠٥)، سنن ابن ماجه (١٣).

(٣)سنن الترمذي (٢٦٦٤).

لەسەر قەنەفەیەکی نەرم شانی داداوە بڵێت: پەڕتووکی خودا لە نێوانماندایە، هەر حەڵاڵێکمان تێدا بینی ئێمەش بە حەڵاڵی دەزانین، هەر حەرامێکیشمان تێدا بینی بە حەرامی دەزانین، باش بزانن کە هەرچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) حەرامی کردبێت وەک ئەوە وایە کە خودا حەرامی کردبێت».

پێشەوا ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا بە دەربڕینێکی دیکە و بە ڕشتەیەکی ساغ هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: «أَلا إنِّى أُوتِيتُ الْكتابَ وَمِثْلهُ مَعَهُ، أَلا إنِّى أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلهُ مَعَهُ، ألا يوشِك رَجُلٌ ينْثَنِي شَبْعَاناً عَلى أريكتهِ يَقُولُ: عَلَيْكمْ بِالْقُرآنِ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلالٍ فَأَحِلّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوه»[١]

واتە: «ئەوە بزانن کە من ئەم قورئانەم پێ دراوە و لەگەڵیشیدا هاوشێوەکەیم پێ دراوە، ئەوە بزانن کە من قورئانم پێ دراوە و لەگەڵیشیدا هاوشێوەکەیم پێدراوە -کە مەبەست پێ فەرموودەیە-، نزیکە کەسانێک بێن بە ورگی تێرەوە لەسەر قەنەفەکەیان پاڵبدەنەوە و بڵێن: تەنیا قورئان وەربگرن، هەر حەڵاڵێکتان تێدا بینی بە حەڵاڵی بزانن و هەر حەرامێکتان تێدا بینی بە حەرامی بزانن.»

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕاستی فەرموو و ئەوەی فەرمووبووی هاتەدی، بێگومان ئەو هەرگیز لە هەوا و ئارەزووەوە قسەناکات، ئەوەی دەیڵێت تەنیا نیگا و وەحی خوداییە، نکوڵیکارانی سوننەت هیچیان نەکرد جگە لەوەی دڵنیاییان زیاترکردین.

---

(١)مسند الإمام أحمد (١٧١٧٤).

## بەڵگەکانی هەڵوێست و کاری هاوەڵان لەسەر بەڵگەیەتی سوننەت:

«هۆی بەڵگەهێنانەوەش بەو هەواڵ و هەڵوێستانەی لەوانەوە گێڕدراونەتەوە هەمان هۆکارە کە لە باسی بەڵگەهێنانەوە بە سوننەت لە بەرانبەر نکوڵیکارانیدا ئاماژەمان پێدا، ئەویش لەبەرئەوەی زۆرێک لە نکوڵیکارانی سوننەت لەمیانی بەڵگەسازییاندا بۆ ڕێبازەکەیان چەند هەواڵێک دێنن لەبارەی هاوەڵانەوە کە پێیان وایە پاڵپشتی هەڵوێستەکەیان دەکات، بۆیە گرنگە ئاگاداری ئەو هەواڵ و گێڕانەوانە ببین کە جەخت لە بەگەورەدانانی سوننەت و کارپێکردنی دەکەنەوە لەلایەن هاوەڵانەوە.»

ئەمەش بەشێوەی دەماودەم (متواتر) لە چەندین هەڵوێستدا لێیان گێڕدراوەتەوە، بەڵکوو لە هیچکام لەوانەوە نەزانراوە کە وازی لە بەڵگەهێنانەوە و کارکردن بە سوننەت هێنابێت، سەیرە کەسانێک هیچ شتێک دەربارەی هاوەڵان نازانن جگە لە چەند گێڕانەوەیەکی لاواز کە وا دەزانن بەڵگەن بۆ بەبەڵگەنەشیانی سوننەت، وەک ئەوەی لەبارەی ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێت.) گێڕدراوەتەوە کە گوایە پێنج سەد فەرموودەی سوتاندووە.

تەنانەت کاتێکیش ڕیوایەتە سەحیح و ڕاستەکان دەهێنن دەکەونە هەڵە لە بەڵگە پێ هێنانەوەیاندا، ئەویش لە دوو ڕووەوە:

**ڕووی یەکەم:** بە هەڵە تێگەیشتن لێیان:

وەک بەڵگەهێنانەوە بە هەڵوێستی عومەر (خودا لێی ڕازی بێت.) بەرانبەر ئەبو موسای ئەشعەری (خودا لێی ڕازی بێت.)، کاتێک ئەبو موسا فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)گێڕایەوە کە تاوەکوو سێ جار مۆڵەت وەردەگیردرێت بۆ چوونە نێو ماڵێک، عومەریش داوای لە ئەبو موسا کرد کەسێکی تر لەگەڵ خۆی بهێنێت کە هەمان هەواڵ لە

پێغەمبەرەوە (ﷺ) بگێڕێتەوە، ئەم ڕووداوە دەکەنە بەڵگە لەسەر بەڵگە نەبوونی فەرموودەی یەکرێ (ئاحاد)، ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە، چونکە شایەتیدانی کەسەکەی تر لەگەڵ ئەبو موسادا فەرموودەکەی لە بازنەی ئاحاد دەرنەکرد، خۆ فەرموودەی ئاحاد مەرج نییە کە تەنیا یەک کەس گێڕابێتییەوە، بەڵکوو ئەو فەرموودەیەیە کە -لە ژمارەی گێڕەرەوان و مەرجەکانیدا- لە خوار فەرموودەی دەماودەم (متواتر)ەوە بێت.

هەروەها، هەڵوێستی عومەر چۆن بوو بەرانبەر فەرموودەکە دوای ئەوەی ئەبو موسا شایەتێکی لەگەڵ خۆی هێنا؟

ئایا ڕەتی کردەوە؟ یاخود گوتی: ئەم گێڕانەوانە پابەندکار نین؟ نا، بەڵکوو وەریگرت و بەدەم ئاخ کێشانیشەوە کە تا ئەوکاتە ئاگاداری ئەم فەرموودەیە نەبووە گوتی: (أَلْهَانِي عَنْهُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ)[١] واتە: "سەودا و مامەڵەی بازاڕ بێئاگای کردم لەم فەرموودەیە."

**ڕووی دووەم**: پشتگوێ خستنی گێڕانەوەکانی تر لەبارەی بەڵگەییەتی سوننەت لای هاوەڵان

لە نموونەی ئەوانەش:

هەڵوێستی ئەبوبەکری سدیق (خودا لێی ڕازی بێت.) لە بابەتی میراتدا: خود ای گەورە دەفەرموویت: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾ [النساء: ١١]

واتە: «خودا لەبارەی کاروباری منداڵەکانتان ڕێنوێنیتان دەکات و پێتان ڕادەگەیەنێت کە بەشەمیراتی نێرینە ئەندازەی بەشی دوو مێینەیە.»

ئەم ئایەتە گشتییە و ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە ماڵ و سامان لە

---

(١)صحيح مسلم (٢١٥٣).

باوانەوە پاش مردنیان بۆ منداڵەکانیان دەگوێزرێتەوە، بۆیە خاتوو فاتیمە (خودا لێی ڕازی بێت.) هات بۆلای ئەبوبەکر، داوای بەشەمیراتی خۆی کرد کە لە باوکییەوە واتە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بۆی بەجێماوە، داواکەشی لەگەڵ ڕواڵەتی قورئاندا تەبا بوو، ئەبوبەکریش (خودا لێی ڕازی بێت.) دەقی فەرموودەیەکی لابوو لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە پێغەمبەران میراتیان لێ نابردرێت و هەر ماڵ و سامانێکیان لەدوا بەجێ بمێنێت دەبێتە سەدەقە و دەبەخشرێت -دەقی ئەم فەرموودەیەش لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا چەسپاوە-[١]، لەبەر ئەم هۆیە میراتی پێ نەدا، ئەگەر ئەبوبەکر (خودا لێی ڕازی بێت.) سوننەتی بە بەڵگەیەکی پابەندکار و سەرچاوەیەکی یاسادانان نەزانیبایە، چۆن هێندە پێداگری لەسەر ئەم بڕیارەی دەکرد لەبەرانبەر سووربوونی خاتوو فاتیمە (خودا لێی ڕازی بێت.) لەسەر داواکەی! هەروەک بۆ جەختکردنەوە لە گرنگی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و نادروستی سەرپێچیکردنی فەرمووی: «إِنِّى أَخْشَى إِنْ تَرَكْتُ شَيْئًا مِنْ أَمْرِهِ أَنْ أَزِيغَ» واتە: "ئەترسم گەر واز لە یەکێک لە فەرمانەکانی پێغەمبەر بهێنم لە لادەران بم و گومڕاببم."[٢]

نموونەیەکی دیکە لە هەڵوێستی هاوەڵان بەرانبەر دەقەکانی سوننەت لەم بەسەرهاتەی ژیانی پێشەوا عومەردا بەدی دەکەین، داب و یاسای عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) وابوو بەشەمیراتی بە ئافرەت نەدەدا لە خوێنبایی مێردەکەی، تاوەکوو زەحاکی کوڕی سوفیان پێی ڕاگەیاند کە -ئەوکاتەی بەرپرسی هۆزەکەی بوو- پێغەمبەر (ﷺ) بە نووسراوێک فەرمانی پێ کردووە کە بەشەمیرات بدات بە هاوسەری (ئەشیەمی زیبابی) لە خوێنبایی مێردەکەی، دواى ئەمە عومەر لە بۆچوونەکەی خۆی

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري (٣٠٩٢)، صحيح مسلم (١٧٥٩)

(٢)صحيح البخاري (٣٠٩٣)، صحيح مسلم (١٧٥٩).

پاشگەزبوویەوە و کاری بەم گێڕانەوەیە کرد.[١]

هەروەها عومەر (خودا لێی ڕازی بێت.) سەختگیری دەکرد لەوەدا کە نابێت نوێژی سوننەت لە کاتە قەدەغەلێکراوەکاندا ئەنجامبدرێت[٢]، تەنانەت هەرکەس ئەو کارەی بکردایە بە گۆچانەکەی لێی دەدا، لەکاتێکدا ئەم قەدەغەیە تەنیا بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)چەسپاوە و لە پەڕتووکی خوادا نییە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (لَوْ كانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ ظَاهِرِهِمَا، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ)[٣] واتە: «ئەگەر دین بە ڕا و بۆچوون بووایە، ئەوا ژێرەوەی گۆرەوی لەپێشتر بوو بۆ سڕین -مەسحکردن- وەک لە سەرەوەی، لەگەڵ ئەوەشدا من پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی مەسحی لە سەرەوەی گۆرەوییەکەی دەکرد.» لێرەدا عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) ئەم قیاس و پێوانەکارییەی وەلانا و کارەکەی پێغەمبەری خودای (ﷺ)بە لەپێشتر دانا، ئەمەش بەڵگەی بایەخدانی زۆریەتی بەم پرسە.

ئەگەرچی هەڵوێستەکانی هاوەڵان (خودا لێیان ڕازی بێت.) لە ڕووی بەبەڵگەزانین و کارکردن بە سوننەتەوە زۆر لەوە زەق و بەرچاوترن کە پێویست بە ئاماژەبۆکردنیان بکات، بەڵام کاتێک چەمک و تێگەیشتنەکان ئاوەژوو دەبنەوە و گومانەکان تەشەنە دەکەن، مرۆڤ ناچار بە باسکردنی بەڵگە و نیشانە دەبێت لەسەریان.

---

(١) سنن أبي داود (٢٩٢٧)، سنن الترمذي (١٤١٥)، سنن ابن ماجه (٢٦٤٢)

(٢) بڕوانە: الموطأ، للإمام مالك (٥٩٠)، مصنف عبدالرزاق (٣٩٦٤).

(٣)بڕوانە: مسند أحمد (٧٣٧)، سنن أبي داود (١٦٢).

## بەڵگەکانی کۆڕای زانایان لەسەر بەڵگەیەتی سوننەت:

زانا و فەقیهی مالیکی ئیبن عەبدولبەری قورتوبی لە پێشەکی پەرتووکی (التمهيد) دا دەڵێت: (أجمع أهل العلم من أهل الفقه والأثر فى جميع الأمصار –فيما علمت- على قبول خبر الواحد العدل وإيجاب العمل به، إذا ثبت، ولم ينسخه غيره من أثر أو إجماع. على هذا جميع الفقهاء فى كل عصر من لدن الصحابة إلى يومنا هذا، إلا الخوارج وطوائف من أهل البدع، شرذمة لاتعد خلافاً).[١] واتە: "سەرجەم زانایان لە ئەهلی فیقەه و شوێنکەوتوانی ڕێبازی پێشین لە هەموو شار و ناوچەکان -هێندەی بزانم- کۆدەنگن لەسەر قەبووڵکردن و واجبێتی کارکردن بە هەر فەرموودەیەک کە کەسێکی ڕاساڵ گێڕابێتییەوە، ئەگەر ڕاستێتی سەلما و هیچ گێڕانەوە و ئیجماعێکی تر نەسخی نەکردبووەوە، هەموو فیقهزانان بەدرێژایی سەردەمان لەسەر ئەمە بوون هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە تا ئەمڕۆ، جگە لە خەواریج و دەستەیەک لە بیدعەکاران، تاقمگەلێکی کەم کە هاوڕا نەبوونیان بە ڕاجیایی هەژمارناکرێت".

هەروەها ئیبن حەزمی ئەندەلوسی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) دەڵێت: (وكذلک إجماع أهل الإسلام كلهم جنّهم وإنسهم فى كل زمان ومكان على أن السُّنَّه واجب اتباعها، وإنها ما سَنَّه رسول اللّٰه (ﷺ) ، ... ، فاعلموا رحمكم اللّٰه أنَّ من اتبع ما صحّ برواية الثقات مسنَداً إلى رسول اللّٰه (ﷺ) فقد اتبع السُّنَّه يقيناً)[٢]. واتە: "بە هەمان شێوە کۆڕای هەموو ئەهلی ئیسلام بە جنۆکە و مرۆڤیانەوە و لە هەموو سەردەم و شوێنێک لەسەر ئەوەیە کە شوێنکەوتنی سوننەت واجبە، لەسەر ئەوەش کە پێغەمبەر (ﷺ)ئەو سوننەتەی داناوە، ... ، ئەوە بزانن هەرکەسێک

---

(١) التمهيد، لإبن عبد البر (٢/١).

(٢) الإحكام في أصول الأحكام (١٢٨/٤).

شوێن فەرموودەیەک بکەوێت کە بە ڕشتەی ساغ و لە ڕێگەی کەسانی باوەڕپێکراوەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)گێڕدرابێتەوە، ئەوە بەدڵنیاییەوە شوێن سوننەت کەوتووە".

بە هەمان شێوە شەوکانی لە پەڕتووکی (إرشاد الفحول) دا دەڵێت: (إن ثبوت حجية السنة المطهرة واستقلالها بتشريع الأحكام ضرورة دينية، ولايخالف فى ذلك إلا من لا حظ له في الإسلام)[١]. واتە: "چەسپاوی بەڵگەییەتی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر (ﷺ) و سەربەخۆییبوونی بە دانانی ڕێسا و حوکمەکان پێویستییەکی ئایینییە، هیچ کەسێکیش پێچەوانەی ئەمە ناڵێت مەگەر کەسێک هیچ بەشی بەئیسلامەتییەوە نەمابێت".

لەم قسەیە ڕامێنە "هیچ بەشی بە ئیسلامەتییەوە نەمابێت" ڕستەیەکی لەم شێوەیە لەو پرسانەدا ناگوترێت کە ئیجماعێکی گومانهەڵگریان لەسەرە.

هەروەک عەبدوڕەحمانی موعەللیمی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە پەڕتووکی (الأنوار الكاشفة)دا کاتێک باس لە بەڵگەییەتی فەرموودەی ئاحاد دەکات، دەڵێت: (والحجج فى هذا كثيرة، وإجماع السلف على ذلك محقق.)[٢] واتە: "بەڵگەکان لەم بارەوە زۆرن، یەکڕابوونی زانایانی پێشینیش لەسەری سەلماوە و گومانی تێدا نییە".

---

(١)إرشاد الفحول، للشوكاني، دار الكتاب العربي (٩٧/١).

(٢)الأنوار الكاشفة، للمعلمي، عالم الكتب (٦٧/١).

## پێگەی سوننەت لە یاسادانان و تەشریعی ئیسلامیدا:

سەرەڕای ئەوەی لەبارەی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت و کاری هاوەڵان و کۆڕای زانایان لەسەر بەڵگەیەتی سوننەت و واجبێتی کارپێکردنی باسکرا، با بیر لەم پرسیارە بکەینەوە:

گریمان بێجگە لە قورئان هیچ سەرچاوەیەکی ترمان نەبوو، هیچ فەرموودەیەک لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمان لەبەردەست نەبوو، ئایا دەتوانین هیچکام لە پەرستش و عیبادەتە سەرەکییەکان بە شێوەیەکی دروست ئەنجامبدەین یا ناتوانین؟

با لە نوێژەوە دەستپێبکەین:

فەرمانی ئەنجامدانی چەند نوێژمان پێ کراوە لە شەو و ڕۆژێکدا؟ ئەمە لە قورئاندا باسکراوە؟

وەڵام: نەخێر، لە قورئاندا باس نەکراوە، بەڵام لە سوننەتدا باسکراوە.

گریمان زانیشمان داوای پێنج نوێژمان لێ کراوە، ئەی چەند ڕکات بکەین لە هەر نوێژێکدا؟ ئەمە لە قورئاندا باسکراوە؟

وەڵام: نەخێر، ئەوە تەنیا لە سوننەتدا باسکراوە.

خۆ ئەگەر خودا لە پەڕتووکەکەیدا فەرمانی پێ کردووین کە پارێزگاری لە نوێژەکان بکەین لە کاتی خۆیدا، کەواتە کەی کاتی نوێژی عەسر -بۆ نموونە- دەست پێ دەکات و کەی کۆتایی دێت؟

ئایا ئەمە لە قورئاندا ڕوونکراوەتەوە؟

وەڵام: نەخێر، بەڵکوو ڕوونکردنەوەکەی تەنیا لە سوننەتدا هاتووە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بەو پیاوەی کە لەبەردەمیدا نوێژی کرد

فەرموو: «ارْجَعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»[1] واتە: «بگەڕێوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد.» ئەویش لەبەرئەوەی نوێژەکەی پایە و مەرجی لەسەرخۆیی (طمأنينة) تێدانەبوو، ئایا ئەم مەرجە -کە بەبێ ڕەچاوکردنی نوێژ دروست نابێت- لە قورئاندا باسکراوە؟

وەڵام: نەخێر، لە قورئاندا بەئاشکرا ئاماژەی پێ نەدراوە و تەنیا لە سوننەتدا باسکراوە.

هەموو ئەمانە تەنیا لە فەریزەیەک لە فەریزەکانی ئیسلام کە نوێژە.

ئەگەریش بێینە سەر بابەتی زەکات، دەبینین کە خودای گەورە لە قورئاندا فەرمانمان پێ دەکات زەکات بدەین و باسی لە سزای ئەو کەسانە کردووە کە زەکات نادەن، بەڵام ئایا زەکات لە کەم و زۆری ماڵ دەکەوێت؟ یان سنوورێکی دیاریکراو هەیە کە ئەگەر سامانەکە گەیشتە ئەو بڕە زەکات لێدەرکردنی واجب دەبێت؟

تەنانەت ئەگەر ئەو بڕەش کە زەکاتی لێ دەکەوێت دیاریکراوبوو، ئەو ڕێژەیە چەندە کە لێی دەردەکرێت تا کەسی زەکاتدەر لە ئەستۆپاکی خۆی دڵنیابێت؟ نیوە یان سێیەک یان چواریەک یان دەیەک یان لە چل بەش بەشێک؟

ئایا ئەم شتانە لە قورئاندا ئاماژەیان پێ دراوە؟

وەڵام: نەخێر، هەموویان لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ)باسکراون.

خۆ ئەگەر باس لە حەجیش بکەین کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام، ئێمە دەزانین کە چەند جێگایەک هەن) پێیان دەوترێت مەواقیت (کە حاجی یاخود عەمرەکار دەبێت بە ئیحرامەوە لێیان دەربچێت، ئەو

---

(١) صحيح البخاري (٧٥٧)، صحيح مسلم (٣٩٧).

جێگایانە کوێن و لەکوێوە ئەوەمان زانی؟

هەموو ئەمانە لە سوننەتدا بە ڕوونی باسکراوە، بەڵام لە قورئاندا باسنەکراون.

لە دیاترین دروشمەکانی حەجیش کە ڕەجمی شەیتانە (ڕەمی جەمەڕات)، ئایا لە قورئاندا باسکراوە؟

نا، باس نەکراوە، تەنیا لە سوننەتی پێغەمبەردایە (ﷺ).

لە هەموو ئەمانە سەیرتر ئێمە تەنیا لەڕێگەی سوننەتەوە زانیومانە کە ئیسلام پێنج پایەی هەیە!

ئەگەر تەماشای گشت لایەنەکانی تری شەریعەت بکەین هاوشێوەی ئەوانە دەبینین کە لە پایەکانی ئیسلامدا ئاماژەمان پێ دا، لە بوونی حوکم و ڕێساگەلێک کە لە سوننەتدا نەبێت باس نەکراون.

بێگومان ئەم نموونانە گرنگی و پلەوپایەی سوننەتمان بۆ ڕووندەکەنەوە لە یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیدا، هەروەها ئەوەی کە سوننەت تەنیا هەواڵگەلێک نییە وەک زانیاری زیادە سوودیان لێ ببینرێت.

دواى ئەمانەی باسکران، لەوانەیە پرسیارێک بێتە پێش، ئەویش: ئایا خوای گەورە نەیفەرمووە: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ [النحل: ٨٩] واتە: «ئەم قورئانەمان بۆ دابەزاندوویت کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە.»

کەواتە بۆچی ئەم یاسا و حوکمە گرنگانە لە قورئاندا باس نەکراون؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: هەر لە میانی ڕوونکردنەوەکانی قورئاندا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ [الحشر: ٧] واتە: «هەرچی پێغەمبەر (ﷺ)پێی دان وەری بگرن و هەرچییەکیشی لێ قەدەغە کردن وازی لێ بهێنن.»

یان ده‌فه‌رموێت: ﴿{وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ [المائدة: ٩٢] واته‌: «فه‌رمانبه‌رداری و گوێڕایه‌ڵی خودا بكه‌ن و گوێڕایه‌ڵی پێغه‌مبه‌ر بكه‌ن.»

یاخود ده‌فه‌رموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ [النساء: ٦٥] واته‌: «نه‌خێر، سوێند به‌ په‌روه‌ردگارت -ئه‌وانه‌ی لافی باوه‌ڕ لێده‌ده‌ن- بڕوادار نین تا تۆ نه‌كه‌نه‌ دادوه‌ر بۆ یه‌كلاییكردنه‌وه‌ی هه‌ر كێشه‌ و ناكۆكییه‌كی نێوانیان.»

هه‌موو ئه‌مانه‌ش سوننه‌ت له‌خۆده‌گرن.

هه‌روه‌ک خودای گه‌وره‌ له‌ په‌ڕتووكه‌كه‌یدا فه‌رموویه‌تی كه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)ئه‌و ئایه‌ت و فه‌رمانانه‌مان بۆ ڕوونده‌كاته‌وه‌ كه‌ بۆمان دابه‌زیوه‌ و قورئان و (حیكمه‌ت)مان فێرده‌كات كه‌ مه‌به‌ست پێی سوننه‌ته‌.[1]

هه‌روه‌ها خودای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾ [النساء: ٥٩]

واته‌: «جا ئه‌گه‌ر له‌ شتێكدا دووبه‌ره‌كیتان هه‌بو، ئه‌وه‌ بیگێڕنه‌وه‌ بۆ لای خودا و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)ئه‌گه‌ر ئێوه‌ باوه‌ڕتان به‌ خوا و به‌ ڕۆژی دوایی هه‌یه‌.»

ئه‌م ئایه‌ته‌ ئاماژه‌ی ئه‌وه‌ی تێدایه‌ كه‌ خودای باڵاده‌ست سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی (ﷺ)ده‌پارێزێت تا ببێته‌ چاوگ وسه‌رچاوه‌ و له‌ كاتی ناكۆكیدا بۆی بگه‌ڕێینه‌وه‌.

به‌ هه‌مان شێوه‌ ئاماژه‌ی ئه‌وه‌ی تێدایه‌ كه‌ فه‌رمووده‌كانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)-له‌گه‌ڵ قورئاندا- هه‌موو لایه‌نه‌كانی شه‌ریعه‌ت له‌خۆده‌گرن، چونكه‌ فه‌رمانی گه‌ڕانه‌وه‌ بۆیان له‌كاتی ناكۆكی به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر بوونی چاره‌سه‌ری

---

(١)له‌ ئایه‌تی ١٦٤ ی سوره‌تی (آل عمران).

یەکلاکەرەوەی ناکۆکی تێیاندا.

لێرەدا پەڵپێک دێتە ئاراوە: هەندێک لە نکوڵیکاران بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ وتەکانی پێغەمبەردا (ﷺ)نییە، بەڵکوو کێشەیان لەگەڵ ڕێگەی گواستنەوە و تۆمارکردنیاندایە، بۆیە دەڵێن: زانستی فەرموودە جێی باوەڕ و متمانەپێکردن نییە، هەر لەبەر ئەمەش کۆی سوننەت ڕەتدەکەنەوە.

بۆ وەڵامی ئەم تانەیەش، لە بەشی داهاتوودا بەڕوونی کەمێک لە پەیڕەوی فەرموودەناسان و ڕێوشوێنەکانیان لە تۆمار و بەبەڵگەنامەکردنی سوننەتدا دەخەینەڕوو.



## فەرموودەناسان چۆن بڕیاری ڕاستێتی فەرموودەیەک دەدەن؟

زانایانی فەرموودە بڕیار لەسەر سەحیح بوونی فەرموودەیەک دەدەن ئەگەر ئەم پێنج مەرجەی تێدا بێت:

١. سەرڕاستی و ڕاساڵی گێرەوەکان (عدالة الرواة)
٢. تۆکمەیی یادگە و توانای لەبەرکردنیان (ضبط الرواة)
٣. پەیوەستی ڕشتەی گێڕەوەکان (اتصال الإسناد)
٤. بێوەیی فەرموودەکە لە ڕیزپەڕیی (السلامة من الشذوذ)
٥. بێوەیی لە عەیبداری (السلامة من العلة)

### مەرجی یەکەم: سەرڕاستی و ڕاساڵی گێڕەوەکان

هەر هەواڵێک لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لە پەرتووکەکانی سوننەتدا

لە ڕێگەی زنجیرەیەک لە گێڕەوانەوە دەگێڕدرێتەوە، کە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)دەست پێ دەکات تا دانەری ئەو پەرتووکانە، لەوانەیە ئەو زنجیرەیە لە سێ گێڕەوە یان چوار یان پێنج یان زیاتر پێکهاتبێت، پاشان فەرموودەناسان بۆ قەبووڵکردنی هەواڵەکە سەرڕاستی و ڕاساڵی هەر یەک لە گێڕەوانی ناو ئەو زنجیرەیەیان بە مەرج داناوە، لێرەدا ڕاساڵی (عەدالەت) واتە: سەلامەتی و بێوەیی لەلایەنی دینداربیەوە، پێچەوانەکەشی بریتییە لە خراپەکاری و (فیسق)، واتە ئەو کەسەی بە تاوان و سەرپێچی و ئەنجامدانی کارە حەرامکراوەکان ناسرابێت، بە سەرڕاست دانانرێت و پشت بە گێڕانەوەکانی نابەسترێت، بۆیە فەرموودەناسان هەواڵەکەی لێ وەرناگرن، لەبەرئەوەی ئەگەر بوێری ئەنجامدانی حەرامەکانی هەبێت بەبێ تەوبەکردن، دوور نییە بوێری ئەوەشی هەبێت کە درۆ بەدەم پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)هەڵبەستێت!

لێرەدا ڕەنگە بگوترێت: دەگونجێت کەسەکە بە ڕواڵەت خۆی بە چاکەکار نیشان بدات، بەڵام لە ناواخندا کەسێکی خراپەکار بێت، لەوانەشە بە کەڵک وەرگرتن لە ڕواڵەتی ساختەی فەرموودە دابنێت و درۆ بەدەم پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)بکات! لە وەڵامی ئەمەشدا دەڵێین: ئەم بابەتە هەرگیز بەسەر فەرموودەناساندا تێنەپەڕیوە، ئەوان لەکاتێکدا بە هەندێک لە گەورە عابید و چاکەکارە ڕاستەقینەکانیان گوتبێت: فەرموودەکانیان وەرمەگرن، لەبەرئەوەی گێڕانەوەکانیان تاقیکردبوونەوە و بە فەرموودەی گێڕەوە متمانەپێکراوەکان بەراوردیان کردبوون و بۆیان دەرکەوتبوو کە فەرموودەکانیان وەک خۆی لەبەرنەکردووە؛ ئەوان کە هەڵەکانی ئەم کەسانەیان بۆ دەرکەوتبێت سەرەڕای حەقیقەتی باش و چاکیان، ئیتر چۆن درۆی ئەوانی تریان بۆ دەناکەوێت وێڕای باشێتی ساختەیان؟

## مەرجی دووەم: تۆکمەیی یادگە و توانای لەبەرکردن

لە تەرازووی فەرمووده‌ناساندا بۆ قەبوڵکردنی هەواڵی گێڕەوەیەک پێویستە کەسەکە سەرەڕای سەرڕاستی بە شارەزایی و تۆکمەیی و توانایەکی لەبەرکردنی باش ناسرابێت.

چونکە گێڕەوەکە دەگونجێت سەرڕاست و چاکەکار بێت، بەڵام لێهاتوویی ئەوەی نەبێت کە هەواڵ و گێڕانەوەکان بەتۆکمەیی لەبەربکات، کەسێکی لەم جۆرە ترسی ئەوەی لەسەر نییە بەئەنقەست درۆ بکات، بەڵکوو ترس لە لێتێکچوون و هەڵەکردنی هەیە.

ئەی فەرمووده‌ناسانی ڕەخنەکار چۆن تۆکمەییی یادگە و وردبینیی گێڕەوەیەک دەزانن؟

بە چەند ئامرازێک ئەمە دەزانن، لەوانە: تاقیکردنەوەی گێڕەوەکە، هەروەها تاقیکردنەوەی گێڕانەوەکانی و بەراوردکردنیان بە گێڕانەوەی متمانەپێکراوەکان، لەم بارەیەوە (ئیبن صەلاح)[١] لە پەڕتووکی (علوم الحديث) و لە جۆری بیست و سێیەمینی زانستەکانی فەرمووده‌دا دەڵێت: «يُعرف كون الراوي ضابطاً بأن نعتبر- أي: نعرض ونختبر - روايته برواية الثقات المعروفين بالضبط والإتقان، فإن وجدنا رواياته موافقة -ولو من حيث المعنى- لرواياتهم، أو موافقة لها فى الأغلب، والمخالفة نادرة، عرفنا حينئذ كونه ضابطاً ثبتاً، وإن وجدناه كثير المخالفة لهم عرفنا اختلال ضبطه ولم نحتج بحديثه»[٢]. واتە: «بەوەدا دەزانرێت کە گێڕەوەکە لە ڕووی

---

(١) (ئیبن صەلاح)، ئەبو عەمر عوسمانی کوڕی عەبدوڕڕەحمان سەلاحەددینی کوردی شارەزوورییە، لەنێوان ساڵانی (١١٨١-١٢٤٥ زایینی) ژیاوە، زانای فەرمووده‌ناس و فەقیهی شافعی و مودەڕیسی زانستی فەرمووده بووە لە «مەدرەسەی صەلاحی» لە بەیتولمەقدیس، دواتریش لە دارولحەدیسی ئەشرەفیەی شام و هەر لەوێش پەڕتووکە بەناوبانگەکەی لە زانستی فەرمووده‌دا دانا کە ناسراوە بە (مقدمة ابن صلاح). -وەرگێڕ-

(٢) علوم الحديث (١٦١)، دار الفكر، تحقيق نورالدين عتر.

یادگە و لەبەرکردنەوە تۆکمەیە کە گێڕانەوەکەی تاقیبکەینەوە و لەبەرانبەر گێڕانەوەی ئەو گێڕەوە متمانەپێکراوانەدا دایبنێین کە بە تۆکمەیی و وردی ناسراون، ئەگەر بینیمان گێڕانەوەکانی هاوتای گێڕانەوەی ئەوان بوو -با لەڕووی واتاشەوە بێت-، یان زۆرینەی کۆکبوو لەگەڵیان و بەدەگمەن جیاوازی هەبوو، ئەوکاتە دەزانین کە تۆکمەیی یادگە و دامەزراوی کەسەکە جێی باوەڕە، ئەگەریش بینیمان دژیەکی لەگەڵیاندا زۆرە ئەوکات شپرزەیی یادەوەری و ناتۆکمەیی کەسەکەمان بۆ دەردەکەوێت و فەرموودەکانی بە بەڵگە وەرناگرین.

بە کورتی، ئەمەی خوارەوە ئەو پەیڕەوەیە کە فەرموودەناسان لەسەری دەڕۆیشتن لە هەڵسەنگاندنی گێڕەوانی فەرموودەدا:

تاقیکردنەوەی فەرموودەکانیان و ڕووبەڕووکردنەوە و بەراوردکردنیان بە فەرموودەی متمانەپێکراوەکانی تر، بە ئەندازەی کۆکبوونی گێڕانەوەکانی ئەم گێڕەوە تاقیکراوەیە لەگەڵ گێڕانەوەی متمانەپێکراوەکان بە تۆکمەیی یادگە و وردبینی حوکمی لەسەر دەدەن. بە ئەندازەی ناکۆکبوونیشی لەگەڵیان لە گێڕانەوەدا بە کەمکردن بێ یان زیادکردن، یان گۆڕینی ناوێک یاخود هەڵگێڕانەوەی ڕشتەیەک یان هەر هەڵەیەکی تری پەیوەندیدار بە تۆکمەیی یادگە و لەبەرکردنیان ئاستی لاوازییان دەزانن.

## مەرجی سێیەم: پەیوەستی ڕشتەی گێڕەوەکان

فەرموودەناسان سەختگیری دەکەن لە دڵنیابوونەوە لە پێکبەستراوی و پەیوەستی سەنەدی ئەو گێڕەوانەی دەیانەوێت حوکمی لەسەربدەن، خۆ ئەگەر پچڕانێکیان تێدا بینی ئەوکات کۆی فەرموودەکە بە لاواز لەقەڵەم دەدەن، چونکە ئەگەر پەیوەستی نەبوو واتای ئەوەیە چەند گێڕەوەیەک

لەو ڕشتەیەدا کەوتوون و ئێمە نازانین حاڵی ئەو ڕاوییەی کە دیارنییە چۆنە، ئایا کەسێکی سەرڕاست و خاوەن یادگەی تۆکمەیە یان نا.

## مەرجی چوارەم: بێوەیی لە ڕیزپەڕی

زاراوەی فەرموودەی ڕیزپەڕ (شاذ) لای فەرموودەناسان بە دوو واتا بەکاردێت:

- **یەکەم:** پێچەوانەکردنی گێڕانەوەی کەسێکی متمانەپێکراو لەگەڵ گێڕانەوەی متمانەپێکراوانی تر، بەم پێیە ئەگەر کەسەکە لە گێڕانەوەکەیدا پێچەوانەی گێڕانەوەی کەسانی متمانەپێکراو بوو ئەوا فەرموودەکەی ڕەتدەکەنەوە و بە ناوێزە و (شاذ) لەقەڵەمی دەدەن.

- **دووەم:** بەتەنیا گێڕانەوە (التفرد): واتە کاتێک فەرموودە گێڕەوەیەک بە تەنیا خۆی فەرموودەیەک لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، فەرموودەکەش لەبارەی بنەمایەک لە بنەماکانی دین بێت، لەکاتێکدا ئەو گێڕەوەیە بەوەش نەناسرابێت کە لە ڕووی تۆکمەیی یادگە و وردبینییەوە لەپێش ئەوانی ترەوە بێت، یاخود گێڕانەوەکەی لەبارەی پرسێکەوە بێت کە ناشێت کەسێکی وەک ئەو بەتەنیا بیگێڕێتەوە، چونکە بێگومان فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو گێڕەواندا بەشێوەیەکی بەرچاو بڵاوبووبوونەوە، بەتایبەتی لەناو چینی شوێنکەوتووانی شوێنکەوتوان (ئەتباعی تابعین) و دوای ئەوانیش، لەبەر ئەم هۆکارەش فەرموودەناسان بەتوندی دژی هەندێک لە شێوەکانی بەتەنیا گێڕانەوە لای گێڕەوەکان دەوەستنەوە و لە بارێکی وادا چەند ڕێسایەکی عەقڵی و ئەزموونکاری پڕبایەخ بەکاردێنن، لەوانەش:

لێکۆڵینەوە و تێڕامان لە دۆخی کەسی بەتەنیا گێڕەوە، تەماشاکردنی

نیشاندارەکان )قەرینەکانی) پەیوەست بە ڕشتەی فەرموودەکە و دەقی فەرموودەکە(ئیسناد و مەتن) کە لێرەدا بواری ڕوونکردنەوەیانمان نییە، پاشان لە ئەنجامی پتەوکاری و ڕەچاوکردنی ئەم نیشاندارانە ڕەنگە بەتەنیا گێڕانەوەکە قەبوڵبکەن یاخود ڕەتی بکەنەوە، چونکە هەموو بەتەنیا گێڕانەوەیەک قەبوڵکراو نییە و هەموو بەتەنیا گێڕانەوەیەکیش ڕەتکراوە نییە.

## مەرجی پێنجەم: بێوەیی لە عەیبداری

ئەم مەرجە گۆڕەپانە مەزنەکەی داهێنانی زانایانی فەرموودە و دەرخەری پێشڕەوی و تێگەیشتووییانە.

ڕەنگە ڕشتەیەکی فەرموودە بێتە بەردەستیان هەر چوار مەرجەکەی پێشووی تێدا بەدیهاتبێت: سەرڕاستی گێڕەوەکانی، تۆکمەیی یادگەی ڕاوییەکە، پەیوەستی سەنەدەکەی و بێوەیی لە ناوێزەیی، ئەمەش واتە: فەرموودەکە بە ڕواڵەت سەحیح و دروستە، بەڵام لای زانایان ئەمە بەس نییە، چونکە دەگونجێت عەیبدارییەکی شاراوەی تێدا بدۆزنەوە کە بەزۆری لە کاتی کۆکردنەوەی ڕێگاکانی گێڕانەوەی فەرموودەکە دەردەکەوێت. ئیبن قەییم لە پەڕتووکی (الفروسية) دا دەڵێت: «وقد عُلم أن صحة الإسناد شرطٌ من شروط صحة الحديث وليست موجبةً لصحة الحديث؛ فإن الحديث إنما يصحّ بمجموع أمور منها: صحة سنده، وانتفاء علته، وعدم شذوذه ونكارته، وألا يكون راويه قد خالف الثقات أو شذّ عنهم»[١]. واتە: «زانراوە کە ساغێتی ڕشتە مەرجێکە لە مەرجەکانی سەحیح بوونی فەرموودە نەک تاکە مەرجی پابەندکەر بێت بۆ سەحیح بوونی، چونکە

---

(١) الفروسية، لابن القيم، دار عالم الفوائد (١٨٦).

لەڕاستیدا فەرمووده کاتێک ساغێتی دەسەلمێت کە چەند مەرجێکی تێدا کۆبووبێتەوە وەک، ڕاستییەتی ڕشتە (سەنەد)، نەبوونی عەیبداری تێیدا، بێوەیی لە ناوێزەیی و نەناسراوی، هەروەها فەرموودەی ئەو گێڕەوەیە لەگەڵ گێڕانەوەی متمانەپێکراوەکاندا دژیەکی و ناوێزەیی نەبێت.

بۆیە فەرموودەناسی ڕەخنەکار کاتێک دەیەوێت حوکم لەسەر گێڕانەوەیەک بدات هەموو سەنەدەکانی کۆدەکاتەوە، پاشان بە چاوێکی ئەزموندارانەوە لێیان وردەبێتەوە و بەراوردیان لەنێواندا دەکات و ژمارەیەکی زۆر لە نیشاندار (قەرینەکان) بەکاردەهێنێت، تا هەندێک لە ڕشتەکان پێشبخات بەسەر هەندێکیاندا لەباری جیاوازبوونیاندا.

هەر بەم ڕێگەی بەراوردکارییە زانایانی فەرموودە هەڵەی متمانەپێکراوەکانیش دەدۆزنەوە و عەیبدارییە شاراوەکانی ڕیوایەتەکان دەردەخەن، مەزنایەتی و وردی زانستی فەرموودەش ئا لێرەدا دەردەکەوێت.

هەروەک پێشەوا (ئیبن صەلاح) لە پەڕتووکی (علوم الحدیث)دا و لە جۆری هەژدەیەمی زانستەکانی فەرموودە، لە خەتیبی بەغدادییەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لەپێشەوا عەلی کوڕی مەدینییەوە کە فەرموویەتی: «إن الحديث إذا لم تُجمَع طُرُقُه لم يتبين خطؤه»[1] واتە: «هەر فەرموودەیەک هەتاوەکوو ڕێگاکانی گێڕانەوەی کۆنەکرێتەوە، هیچ هەڵەیەکی تێدا ڕووننابێتەوە.»

بە ئاگاداربوون لە کۆی ئەم پێنج مەرجەش، ئەندازەی ئەو کورتبینییەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە لە مامەڵەی هەندێک لە لاواندا هەیە بەرانبەر سوننەت و زانستەکانی و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

---

(١) علوم الحديث (٩١).

## زانستی بلیمەتەکان

زۆرن ئەو پرسیار و تۆمەتانەی ڕووبەڕووی زانستی فەرمووده دەکرێنەوە بەتایبەت لەم سەردەمەدا، هەندێک لەم تۆمەتانە شیاوی ئەوەن کە بەوردی وەڵامبدرێنەوە تا ئەو هەڵەتێگەیشتنەی دروستبووە نەمێنێت، هەندێکیش لەوانە کاتێک کەسی شارەزا و تایبەتمەند لە زانستی فەرمووده دەیانبیستێت یان دەیانخوێنێتەوە سەری سووڕدەمێنێت لەو ئاستەی بەدگومانی کە خاوەنەکانیان پێی گەیشتوون و لەژێر ناوی نوێگەری و ڕزگاربوون لە کۆت و بەندەکاندا بانگەشەی بۆ دەکەن، لەکاتێکدا ئەو تۆمەت و گومانانە لە تەرازوویەکی زانستیدا هاوتا نابن بە سفریش!

پوختەی مەبەست لە هەموو ئەم پرسیار و تۆمەت و گومانانەش بۆ ئەوەیە کە بڵێن زانستی فەرمووده زانستێکی ورد و بەس نییە بۆ سەلماندنی ڕاستییەتی یان هەڵبەستراوی ئەو قسەیەی دەدرێتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)، و ئەم زانستە تێکەڵ بە ئامڕاز و گەمەکانی سیاسەت و تایەفەگەری کراوە و ئەمانە بەتەواوی دەستیان بەسەرداگرتووە و کاریگەرییان لە دروستبوون و دەرەنجامەکانیدا هەبووە.

هیچ گومانم نییە لەوەی زۆرینەی ئەو کەسانەی ئەم تۆمەتانە فڕێدەدەن ئاگادارییەکی تەواویان نییە لەو زانستەی لەبارەیەوە دەدوێن چ بگات بەوەی شارەزا بن تێیدا.

لەڕاستیدا هەوڵدان بۆ سەلماندنی وردی زانستی فەرمووده و ڕەوایی و دادوەرانە بوونی پێوانەکانی قسەوباسێکی درێژخایەن دەخوازێت، هەروەک پێویست بە خستنەڕووی نموونەگەلێکی بێشومار دەکات کە ڕاستی ئەم پرسە دەسەلمێنن.

لێرەدا دەمەوێت تەنیا باس لە بەشێکی کەم لە بەشەکانی ئەم

زانستەتان بۆ بکەم وەک نموونەیەک بۆ ئەوانی دیکەش، ئەویش سەبارەت بە گێڕەوانی فەرموودەکان و چۆنێتی حوکمدان لەسەریان بەوەی متمانەپێکراون یان لاواز.

لەوانەیە سەرت سووڕبمێنێ گەر پێت بڵێم زانایانی فەرموودە لە تۆمارە مەزنەکانیاندا زانیارییان لەبارەی هەزاران کەس لە گێڕەوانی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)نووسیوەتەوە، چەشنی تۆمارە ئەلکترۆنییەکانی خوێندکارانی زانکۆیەک لە زانکۆ پێشکەوتووەکان کە دۆسیەی تێر و تەسەلی گشت قوتابییەکانی تێدایە و زانیارییە کەسی و زانستییەکان و مێژووی خوێندنی پێشوو و ئێستای و ئاستەکەی و چەندین زانیاری دیکەش لەخۆدەگرن.

ئەم باسە درۆ و ساختەکاری نییە بۆ ئەو زانستە بەڵکوو واقیعێکی حاشاهەڵنەگرە، لێرەدا نموونە بە یەکێک لەو پەڕتووکانە دەهێنمەوە کە بە تۆمارێکی گەورە دادەنرێت و لەبارەی هەزاران گێڕەوەی فەرموودەوە نووسراوە.

ئەویش پەڕتووکی (تهذيب الكمال في أسماء الرجال) کە دانەرەکەی پێشەوای زانا ئەبوحەجاج یوسف ئەلمیززی (المزي) یە و) لەساڵی ٧٤٢ ی کۆچیدا (کۆچی دوایی کردووە، ئەم پەڕتووکە لە سی و پێنج بەرگدا لەچاپدراوە! ئەم بەرگانە زیاتر لە هەشت هەزار دۆسیەی ئەو گێڕەوانەی لەخۆگرتووە کە لە شەش پەڕتووکەکەدا (الكتب الستة) گێڕانەوەیان هەیە، کە بریتین لە: بوخاری، موسلیم، ئەبو داود، ترمزی، نەسائی و ئیبن ماجە!

هەرچی گێڕەوەکانی تریشە کە لەم شەش پەڕتووکەدا ڕیوایەتیان نییە وەک گێڕەوەکانی ناو «موسنەدی ئیمام ئەحمەد و سونەنی بەیهەقی و موستەدرەکی حاکم» ئەوانیش چەند پەرتووکێکی تر هەن لەبارەیانەوە دەدوێن جگە لە پەڕتووکی (تهذيب الكمال).

سەیر لەوەدایە ئەم پەڕتووکە گەورە «٣٥ بەرگییە» تەنیا پوختەی پەڕتووکێکی لە خۆی گەورەترە بە ناوی (الکمال)، واتە ئەم پەڕتووکەی باسی دەکەین پوختەکراوی پەڕتووکی) الکمال(ە کە زانای حافز و فەرموودەناس» عەبدولغەنی مەقدیسی» نووسیویەتی.

هەر دۆسیەیەک لە دۆسیەکانی گێڕەروانی ناو پەڕتووکی (تهذيب الکمال) ئەم زانیارییانە لەبارەی گێڕەرەوەکە لەخۆدەگرێت: ناوی خۆی، ناوی باوکی، تیرەکەی، نازناوی، لە کێوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کێ فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، مێژووی مردنی، حاڵی لە ڕووی متمانەپێکراوی و لاوازی، ئاماژەدان بە هەندێک بابەتی فەرموودەیی پەیوەست بە گێڕانەوەکانی ئەگەر لەو گێڕەوانە بێت کە لە باسکردنی حاڵیاندا پێویست بە وردەکاری دەکات.

لێرەدا نموونەی یەکێک لەو دۆسیانە دەخەینەڕوو تا وێنەکە ڕوونتر بێت.

یەکێک لە گێڕەوانم لەم پەڕتووکە مەزنەدا بۆ هەڵبژاردوویت، ناوی «یەحیای کوڕی زەکەریا»یە، پاشان لەگەڵ دەقی دۆسیەکە جێت دەهێڵم کە زۆریش کورتم کردووەتەوە، چونکە دۆسیەی ئەم گێڕەوەیە زۆر دوور و درێژە، چەشنی زۆرێک لە دۆسیە دوور و درێژەکانی ناو پەڕتووکەکە.

دانەری پەڕتووک (المزي) دەڵێت:[١]

"یەحیای کوڕی زەکەریا کوڕی ئەبو زائیدە یە، باپیری ناوی مەیموونی کوڕی فەیروزی هەمەدانی وادعی بووە، ناسراوە بە ئەبو سەعیدی کوفی، ئازادکراوی ئافرەتێک بووە لە هۆزی وەداعە، وتراویشە: ئازادکراوی موحەممەدی کوڕی مونتەشری هەمەدانییە.

---

(١) تهذيب الكمال (٣٠٥/٣١ ط.الرسالة).

فەرموودەی لەم کەسانەوە گێڕاوەتەوە: ئەبو یەعقوب ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی سەقەفی (د ت ق)، ئیسرائیلی کوڕی یونس (م)، ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید و حاریسەی کوڕی ئەبو ڕەججال (ق)، حەججاجی کوڕی ئەرتەئە (م س)، و حورەیسی کوڕی ئەبو مەتەڕ (ق).“

پاشان ئاماژە بە زۆرێکی دیکە لە مامۆستا و شێخەکانی دەدات لەگەڵ دانانی هێما لەدوای ناوەکانیان، بەڵام لەپێناو کورتبڕی سڕیمنەوە.

ڕەنگە تێبینی ئەو هێمایانە بکەیت کە دانەر لەبەردەم ناوی هەر یەکێک لە شێخەکانی یەحیای کوڕی زەکەریا دایناون، ئەم هێمایانەش یەکێکن لە سەرنجڕاکێشترین شتەکانی ناو ئەم پەڕتووکە، بەڵکوو لە تەواوی زانستی فەرموودەشدا، ڕوونکردنەوەکەی بەکورتی بەم شێوەیە:

بیرتە ئێمە لە سەرەتادا وتمان ئەم پەڕتووکە تایبەتە بە گێڕەرەوانی ناو شەش پەڕتووکەکە، هەریەکێک لەم پەڕتووکانە هێمایەکیان هەیە، بوخاری (خ)، موسلیم (م)، ئەبوداود (د)، -ترمذي- (ت)، نەسائی (س) و ئیبن ماجە (ق). بەم پێیە کاتێک نووسەر پێمان دەڵێت: لە ئەبو یەعقوب ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی سەقەفییەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە (د ت ق(، واتای ئەوەیە: گێڕانەوەی یەحیای کوڕی زەکەریا لەم شێخەیەوە کە ئەبو یەعقوبە لە هەر شەش پەڕتووکەکەدا نییە، بەڵکوو تەنیا لە)د)دا کە ئەبو داودە و لە (ت) دا کە (ترمذی) یە و لە(ق)دا کە ئیبن ماجە یە هەیە!

ئەم وردکارییە زیاتر لە خەیاڵی دەچێت گەر بزانیت کە ئەمانە لەبارەی هەزاران گێڕەوەی فەرموودەوە نووسراون، هەر گێڕەوەیەکیش لەوان ژمارەیەکی ئێجگار زۆر شێخی هەیە، لەوەش زیاتر هەمان کار ئەنجامدەداتەوە لە دانەپاڵی ڕیوایەتی قوتابییەکانی ئەو ڕاوییە لە شێخەکانیانەوە و هێماکانیش دادەنێتەوە، وەک لێرەدا دەیبینیت.

کاتێک دەڵێت: ”ئەوانەی فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە: ئیبراهیم کوڕی موسای فەڕڕا (خ م د)، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (م)، ئەحمەدی کوڕی مەنیعی بەغەوی (د ت س)، ئەسەدی کوڕی موسا (د)، ئیسماعیلی کوڕی ئەبانی وەڕڕاق (ص د)، ئیسماعیلی کوڕی تەوبەی قەزوینی (ق)، حەسەنی کوڕی عەرەفە و حسەینی کوڕی عەلی کوفی (د).“ ژمارەیەکی زۆر قوتابی دیکە باسدەکات کە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە بەڵام لەپێناو کورتبڕی ئەوانیشم نەهێنا.

پاشان لێرەوە دەستدەکات بە گواستنەوەی قسەی فەرموودەناسان لەبارەی حاڵی ئەم گێڕەوەیەوە لەڕووی متمانەپێکراوی و بەهێزی یادەوەرییەوە (کە لێرەشدا بە کورتکردنەوەوە دایدەنێم)، دانەری پەڕتووک دەڵێت:

«ئیبراهیمی کوڕی موسای فەڕڕا» لە «ئەبو خالیدی ئەحمەڕ»ەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: (كان جيد الأخذ) بە واتای: فەرموودەی بەباشی وەرگرتووە، هەروەها لە «حەسەنی کوڕی پابت»ەوە گێڕاویەتییەوە کە گوتویەتی :لای زاناترین کەس لە خەڵکی کوفە لامدا، کە مەبەستی یەحیای کوڕی ئەبو زائیدەیە.

هەروەک عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش لە باوکییەوە و لە ئیسحاقی کوڕی مەنسوڕ و ئەحمەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو مەریەمەوە گێڕاویەتییەوە کە ئەوانیش لە «یەحیای کوڕی مەعین» -گەورە زانای جێباوەڕی فەرموودەناسی- گێڕاویانەتەوە کە گوتویەتی: (ثقة) متمانەپێکراوە.

هەروەها عوسمانی کوڕی ئەبو سەعیدی دارمی دەڵێت: ”بە یەحیای کوڕی مەعینم گوت: ئیسماعیلی کوڕی زەکەریات لا خۆشەویستتر و پەسەندترە یان یەحیای کوڕی زەکەریا؟ گوتی: یەحیا خۆشەویستترە لام.

پێم گوت: لای تۆ ئەو دووانە برای یەکترن؟ گوتی: نەخێر.“

عەلی کوڕی مەدینی یش دەڵێت: ”(هو من الثقات) ئەو لە متمانەپێکراوەکانە ”. لە جێیەکی تردا دەڵێت: ”هیچ کەسێک لە کوفەدا نەبوو لەپاش سوفیانی سەوری لە یەحیای کوڕی ئەبو زائیدە دامەزراوتربێت، لە جێیەکی دیکەشدا دەڵێت: عیلم و زانست لەلای ئیبن عەباس گەیشتە چڵەپۆپە لە سەردەمی خۆیدا، پاشان لای شەعبی لە سەردەمی خۆیدا، پاشان لای سفیانی سەوری لە سەردەمی خۆیدا، پاشان لای یەحیای کوڕی ئەبو زائیدە لە سەردەمی خۆیدا.“

هەروەها ئەبو حاتەم دەڵێت: (مستقيم الحديث، صدوق، ثقة) واتە: ”فەرموودەکانی دروست و دامەزراون، سەرڕاست و متمانەپێکراوە“.

نەسائی دەڵێت: (ثقة، ثبت) متمانەپێکراو و دامەزراوە.

(عیجلی)یش دەڵێت: متمانەپێکراوە، لەو کەسانەیە کە فیقە و فەرموودەی لەلا کۆبووبووەوە و قازی شاری مەدائین بووە، بە یەکێک لە پێشەوایانی فەرموودە دەژمێردرێت لە کوفەدا، موفتی جێباوەڕ و دامەزراو و هەڵگری سوننەت بوو.[١]

کەواتە فەرموودەناسان بڕیاریاندا لەسەر ئەوەی ئەم گێڕەرەوەیە جێی متمانەیە و لە بەرزترین ئاستەکانی متمانەپێکراویشدایە، چونکە بە دامەزراو (ثبت) وەسفیان کرد سەرەڕای وەسفکردنی بە متمانەپێکراوی، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا حەزدەکەم لەگەڵم بێیت تا هەڵوەستە بکەین لەسەر ئەم دەربڕینەی کە زۆر گرنگە و وردییە سەرسوڕهێنەرەکەی فەرموودەناسانمان بۆ دەردەخات، نووسەری پەڕتووک (المزي) دەڵێت:

---

(١) تهذيب الكمال (٣١/٣٠٨-٣٠٩ ط، الرسالة).

"هەروەها غەللابی و عەبباسی دوری لە یەحیای کوڕی مەعینەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی:

یەحیای کوڕی زەکەریا کەسێکی زیرەک بوو، نەمزانیوە هەڵەی کردبێت تەنیا لە یەک فەرموودەدا نەبێت، کە لە سوفیانەوە ئەویش لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕاویەتیەوە."[١]

سەرنج بدە: فەرموودەناسان وێڕای ئەو هەموو ستایش و پیاهەڵدانەی لەبارەی لێهاتوویی و پتەوی یادگەی ئەم گێڕەوەیەوە گوتیان، بەڵام ئەوەیان بەسەردا تێنەپەڕیوە کە لە یەک فەرموودەدا هەڵەی کردووە، بەڵکوو ئەو فەرموودەیەشیان زانیوە و دیارییانکردووە کە هەڵەی تێدا کردووە!

پاشان (المزي) بە هێنانی وتەی زانایان لەبارەی ساڵی مردنەکەی کۆتایی بە ژیاننامەی ئەم گێڕەرەوەیە دەهێنێت، هەندێک لەو بۆچوونانەش کە لەم بارەیەوە دەیانگوازێتەوە ئەمانەن:

"هەیسەمی کوڕی عەدی دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی هاروون کۆچی دوایی کردووە.

عەلی کوڕی مەدینییش دەڵێت: لەساڵی سەد و هەشتا و دوو مردووە.

هاروونی کوڕی حاتەم و موحەممەدی کوڕی سەعد و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای حەزرەمی دەڵێن: ساڵی سەد و هەشتا و سێ لە مەدائین مردووە، موحەممەدی کوڕی سەعد زیاتر لەوەش دەڵێت: تا ئەو کاتە قازی بووە لەو شارە."[٢]

لێرەوە ئەم پەڕە جوان و درەوشاوەیەی فەرموودەناسی هەڵدەدەینەوە

---

(١) تهذيب الكمال (٣١/٣١٠ ط. الرسالة).

(٢) تهذيب الكمال (٣١/٣١١ ط. الرسالة).

تا بچینە سەر پەڕەیەکی دیکە کە لە جوانیدا هیچی کەمتر نییە لەوەی پێشوو، ئەویش باسکردنە لە چۆنێتی حوکمدانی فەرمووەدەناسان لەسەر گێڕەوانی فەرموودە کە کامیان متمانەپێکراون و کامیان لاوازن.

ئەوەی شارەزای زانستی فەرموودە بێت دەزانێت کۆمەڵێک زانای هەڵکەوتە لەم زانستەدا هەبوون کە لە حوکمدان بەسەر گێڕەوانی فەرموودەدا بێوێنە بوون، بەڵام ئەوانەی ئاگاداری زانستەکە نین ڕەنگە لە هەندێک خاڵ و وردەکاری ئەم پرسەدا سەریان سووڕبمێنێت، بۆ نموونە: فەرموودەناسێک حوکم لەبارەی گێڕەوەیەک دەدات بەوەی کە متمانەپێکراوە یان لاوازە، لەکاتێکدا ئەم گێڕەوەیە هاوسەردەمی ئەمیش نییە، بگرە لەوانەیە پێش لەدایکبوونی ئەم فەرموودەناسەش مردبێت! ئەی چۆن توانی حوکمی لەسەر بدات؟

بە هەمان شێوە کاتێک فەرموودەناسێک حوکم لەسەر گێڕەوەیەک دەدات- هاوسەردەمی بێت یاخود نا- بەوەی لە لەبەرکردندا ڕێک و پێک و بێ کێشەیە، ئایا ئەمە پێویستی بە پێوەرێکی ورد نییە کە ئاستی لەبەرکردن و تۆکمەیی یادگەی پێ دیاری بکرێت؟

لەگەڵم وەرە تا لەم هەڵوێستەدا بەدوای وەڵامەکەدا بگەڕێین:

یەحیای کوڕی مەعین -مامۆستای فەرموودەناسان و یەکێک لە گەورە زانایانی پێشینی فەرموودە- دەڵێت: (قال لي إسماعيل ابن عُلَيّة يوماً: كيف حديثي؟ قلتُ: أنت مستقيم الحديث. قال: فقال لي: وكيف علمتم ذاك؟ قلتُ له: عارضنا بها أحاديث الناس، فرأيناها مستقيمة، قال: فقال: الحمد لله)[١] واتە: «ڕۆژێک ئیسماعیلی کوڕی عولەییە پێی گوتم: فەرموودەکانی من چۆنە بەلاتەوە؟ گوتم: گێڕانەوەی تۆ ڕێک و تەواوە، پێی گوتم: چۆن

---

(١) معرفة الرجال – رواية ابن محرز (٣٩/٢).

ئەوەتان زانی؟ پێم گوت: فەرموودەکانتمان لەگەڵ فەرموودەی کەسانی تر بەراوردکردووە، بینیمان تەواو و دروستن، پاشان گوتی: سوپاس بۆ خودا.»

تێبینی چیت کرد لەم بەسەرهاتەدا؟

ئیسماعیلی کوڕی عولەییە یەکێک لە بەناوبانگترین گێڕەوانی فەرموودە پرسیار لە یەحیای کوڕی مەعین دەکات کە بە مامۆستای هەڵسەنگاندنی ڕاوییەکان دادەنرێت و دەپرسێت: فەرموودەکانم چۆنن؟ واتە: گێڕانەوەکانم چۆنن، تۆکمەیی لەبەرکردن و یادەوەریم چۆنە لەو فەرموودانەی دەیانگێڕمەوە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە گێڕانەوەی ڕێک و تەواوە، پاشان ئیسماعیل بەهەمان ئەو پرسیارەی ئێمە لەسەرەوە کردمان لێی دەپرسێت: چۆن زانیت کە من یادەوەریم تۆکمەیە و فەرموودەکانم ڕێک و تەواون؟ فەرموودەناسان چۆن ئەمە دەزانن؟

لێرەدا ئیبن مەعین ڕستە گرنگەکەی گوت: (عارضنا بها أحاديث الناس فرأيناها مستقيمة) واتای ئەوەیە :"کردەیەکی تاقیکردنەوە و بەراوردکارییمان ئەنجامدا لە نێوان گێڕانەوە و فەرموودەکانت لەگەڵ گێڕانەوەی فەرموودەزانە متمانەپێکراوەکانی تر، بینیمان گێڕانەوەکانت کۆکن لەگەڵ گێڕانەوەکانی ئەوان و دژیەکییان تێدا نییە، بۆیە دوای ئەم بەراوردە زانستی و تاقیکردنەوە وردە زانیمان کە تۆ متمانەپێکراویت".

کەواتە ئەمە ئەو پەیڕەوەیە کە فەرموودەناسان بۆ حوکمدان لەبارەی گێڕەوانی فەرموودە لەسەری ڕۆیشتوون، تاقیکردنەوەی فەرموودەکانیان و ڕووبەڕووکردنەوە و بەراوردکردنیان بە فەرموودەی ڕاوییە متمانەپێکراوەکانی تر، بە ئەندازەی چەندبارەبوونەوەی هاوکۆکی و تەبایی ئەم ڕاوییە لەگەڵ ڕاوییە متمانەپێکراوەکانی تر ئاستی تۆکمەیی یادگە و لەبەرکردنی دەردەکەوێت، بە ئەندازەی ناکۆکبوونیشی لەگەڵیان لە گێڕانەوەکانیدا بەزیادکردن بێت یان کەمکردن، یان گۆڕینی ناوێک، یاخود هەڵگێڕانەوەی

ڕشتەیەک، یان هەر هەڵەیەکی تری پەیوەندیدار بە تۆکمەیی یادگە و توانای لەبەرکردنی، ئاستی لاوازییەکەی دەزانن.

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە ئیبن صەلاح لە پەڕتووکی (علوم الحديث) دا دەڵێت[١]: "بەوەدا دەزانرێت کە گێڕەرەوەکە لە ڕووی یادگە و لەبەرکردنەوە تۆکمەیە کە گێڕانەوەکەی تاقیبکەینەوە و لەبەرانبەر گێڕانەوەی ئەو گێڕەوە متمانەپێکراوانەدا دایبنێین کە بە تۆکمەیی و وردی ناسراون، ئەگەر بینیمان گێڕانەوەکانی هاوتای گێڕانەوەی ئەوان بوو -با لەڕووی ماناشەوە بێت-، یان زۆرینەی کۆکبوو لەگەڵیان و بەدەگمەن جیاوازی هەبوو، ئەوکاتە دەزانین کە تۆکمەیی یادگە و دامەزراوی کەسەکە جێی باوەڕە، ئەگەریش بینیمان دژیەکی لەگەڵیاندا زۆرە ئەوکات شپرزەیی یادەوەری و ناتۆکمەیی کەسەکەمان بۆ دەردەکەوێت و فەرموودەکانی بە بەڵگە وەرناگرین."[٢]

هەر لەبەر ئەمەشە دەبینیت زۆرێک لە زانایانی فەرموودە تەنانەت فەرموودە لەو کەسانەش وەردەگرن کە لە لایەنی بیروباوەڕ و عەقیدەوە سەرپێچییان هەیە و لە پەڕتووکی فەرموودە سەحیحەکاندا (الصحاح) گێڕانەوەکانیان دەهێنن، بە مەرجێک کەسەکە ڕاستگۆ بێت و بۆیان سەلمابێت کە فەرموودەکانی ڕێک و تەواو و بێگرفتن، وێڕای نەشاردنەوەی ناکۆکی تەواویان لەهەمبەر سەرپێچی و لادانەکەی، لە دیارترین نموونەکان بۆ ئەمە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمە، ئیبن حەجەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە پەڕتووکی (هدي الساري)دا کە پێشەکی شەرحەکەیەتی بۆ سەحیحی بوخاری، لێکۆڵینەوەیەکی ورد دەکات لەبارەی هەموو ئەو گێڕەرەوانەی ناو سەحیحی بوخاری کە سەرپێچی و لادانی

---

(١) دەقی عەرەبی وتەکە لە بەشی پێشوودا ئاماژەی پێدراوە.

(٢) مقدمة ابن صلاح (١٦١).

عەقیدەییان لێ بە ڕەخنە گیراوە و جۆری سەرپێچییەکەش ڕووندەکاتەوە لەگەڵ بڕێک وردەکاری تر لەو بارەیەوە، ئەمەش بانگەشەی هەندێک کەسی پەلەکار پووچەڵدەکاتەوە کە بە قسەکانیان وا نیشاندەدەن وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی فەرموودەکان لای فەرموودەناسان پشتی نەبەستووە بە پرسی تۆکمەیی یادگە و ڕاستگۆیی، بەڵکوو تەنیا لەسەر بنەمای مەزهەب و ڕەوتگەری بووە!

لەگەڵ ئەوەی گومانی تێدا نییە لە نێو فەرموودەناساندا کەسانێکیش هەن کە فەرموودە لە بیدعەکارانەوە ناگێڕنەوە، بەڵام لەڕاستیدا زۆرینەی فەرموودەزانان بە پێی وردەکارییە زانراوەکانی ناو پەڕتووکەکانی فەرموودەناسی فەرموودەیان لێ وەرگیراوە -نەک لەسەر بنەمای مەزهەبگەرایی-.

هاوشێوەی ئەم کورتهێنانەی لە تێڕوانین و وێناکردنی هەندێکدا هەیە بۆ پەیڕەوی فەرموودەناسان لە حوکمدانیان لەسەر گێڕەوان و وەرگرتنی فەرموودەکانیان، کورتهێنانێکی تری هەڵە هەیە لەبارەی پەیڕەو و مەنهەجی ئەوانەوە لە حوکمدانیان لەسەر ڕشتە و تێکست (ئیسناد و مەتن)ی فەرموودەکان، بەجۆرێک کە بانگەشەی ئەوە دەکرێت گوایە تەنیا لەسەر بنەمای ڕشتە و زنجیرەی گێڕەوەکان بڕیاریان لەسەر فەرموودەکان داوە، ئەم بانگەشەیەش هەرگیز ڕاست نییە، چونکە فەرموودەناسان ڕەچاوی سەرنجدان لە دەق و تێکستی فەرموودەکانیش دەکەن، بەڵکوو هەندێکجار حوکم لەسەر گێڕەوەیەک دەدەن بە لاوازییەتی فەرموودەکانی ئەگەر لەو دەقانەدا کە دەیگێڕێتەوە شتانێکی نەناسراو (مونکەر) بهێنێت! وردەکاری ئەم بابەتەش دوور و درێژە و لێرەدا بواری شیکردنەوەی نییە.[1]

---

(١) بۆ درێژەی ئەم بابەتە و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەبارەی گرنگیدانی فەرموودەناسان بە هەڵسەنگاندنی مەتنی فەرموودەکان بڕوانە پەڕتووکی (تثبيت حجية السنة)ی هەمان نووسەر (ئەحمەد سەبیید). (لاپەڕە ١٢٩-١٣١) -وەرگێڕ-

مەبەست لەم چاوپێداخشاندنە خێرایەی بەشێکی کەم لە زانستی فەرموودە بۆ ئەوە بوو: تا بزانین ئەم زانستە چەند ورد و تۆکمەیە و شیاوی ئەوەیە پێوەر بێت بۆ وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی ئەو وتە و کردارانەی دەدرێنە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ).

## بەڵگەیەتی کۆڕا (ئیجماع)

لە ڕابردوودا گەنگەشەی پرسی کۆڕا و ئەو وردەکاری و حوکمانەی پەیوەستن پێیەوە تایبەت بوو بە زانایانی شەریعەت و لەناو ئەوانیشدا زانایانی بنەماکانی فیقە (أصول الفقه)، بەڵام ئێستاکە قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە چیتر لە شارەزایانی زانستی شەرعیدا کورتهەڵنایەت، بەڵکوو زانا و نەزان قسەی تێدا دەکەن، تەنانەت بووەتە جێی مشتومڕ و کێشە لای توێژێک لە لاوانی موسڵمان کە گرنگی بە لایەنی هزری و فەرهەنگی دەدەن، بەجۆرێک چیتر لامان سەیر نییە کە گەنجێک ببینین -لە کوڕان و لە کچانیش- لەکاتێکدا هیچ شتێکی لە زانستە شەرعییەکان نەخوێندووە کەچی دەستەواژەیەکی ئیمام ئەحمەد دەکاتە بەڵگە کە گوتوویەتی: (من ادّعى الإجماع فهو كاذب)[1] واتە: ”ئەوەی بانگەشەی کۆڕا بکات درۆ دەکات، پاشان دێت ئەم قسەیە بەسەر پرسێکدا دەسەپێنێت کە بۆ ئەوە نەوتراوە.“

لێرەدا نامەوێت تاوتوێی پرسەکانی ئیجماع و وردەکارییەکانی نێو بابەتەکانی زانستی (أصول الفقه) بکەم، بەڵکوو هەوڵدەدەم ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانە بخەمەڕوو لەبارەی ئەو مامەڵە سەردەمییەی لەگەڵ پرسی ئیجماعدا و بەشێوەیەکی دوور لە پەیڕەوی زانستی دەکرێت.

سەرەتا با ئاماژە بە هەندێک لە بۆچوون و تێڕوانینە سەردەمییە هەڵەکان بدەین کە لەبارەی ئیجماعەوە هەن لەوانە:

---

(١) مسائل أحمد بن حنبل رواية ابنه عبدالله، نشر المكتب الإسلامي (ص ٤٣٨-٤٣٩)

١. شیانی هەڵەبوونی کۆی ئوممەت بەدرێژایی سەدە و سەردەمەکانی، بەستنەوەی ئەمەش بە بەڵگەنەبوونی ئیجماعەوە.

٢. یەکێکی دیکە لە تێڕوانینە هەڵەکان: جیاوازی نەکردن لەنێوان کۆڕای بڕاوە و بێگومان «ئیجماعی قەتعی» و کۆڕای گومانهەڵگر «ئیجماعی زەننی».

٣. تێکەڵکاری لەنێوان لاساییکردنەوە و تەقلیدی ناپەسەند لەگەڵ قەبووڵکردنی کۆڕای موسڵمانان و شوێنکەوتنی.

٤. ڕەواییدان بە دەرچوون لە بنەما مەنهەجی و زانستییە گشتییەکان کە لەنێو گشت زانایاندا هاوڕاییان لەسەرە، وەک بەمەرجگرتنی کۆکبوون لەگەڵ زمانی عەرەبی بۆ دروستێتی تەفسیری ئایەتەکانی قورئان، هەروەها پشتبەستن بە سوننەت وەک سەرچاوەیەکی یاسادانان و تەشریع لە ئیسلامدا.

لەڕاستیدا ئەم چەشنە تێڕوانینانە زۆر دوورن لە پرسی ئەوەی: ئایا کۆڕا بەڵگە و حوججەیە یان نا، بەڵکوو تەنیا بڕێک تێکوەردان و هەڵەکارین کە لەسەر بنەمای تێڕوانینی هەڵە بۆ بابەتی ئیجماع و بەڵگەکانی دروستبوون.

سەبارەت بە شیانی هەڵەبوونی هەموو ئوممەت بەدرێژایی سەدەکانی و بەستنەوەی ئەوەش بە بەڵگەنەبوونی ئیجماعەوە، لەڕاستیدا ئەوەی ئەم بانگەشەیە دەکات بەرهەڵستی هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانە دەکات کە باس لە چاکێتی و سەرڕاستی و دادگەرێتی ئەم ئوممەتە دەکەن، وەک خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ [آل عمران: ١١٠]

واتە: «ئێوە چاکترین ئوممەتێک بوون کە بۆ سوود و ڕێنموونی خەڵکی هێنرانە سەر زەوی، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن.»

خۆ ئەگەر بشێت ئەم ئوممەتە بەدرێژایی سەدەکانی لەسەر گومڕایی کۆببێتەوە، بەو پێیە دەشێت فەرمان بە خراپە و قەدەغەی چاکە بکات؛ ئەمەش پێچەوانەی ئایەتەکەیە.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ [البقرة: ١٤٣] واتە: «بەو شێوەیەش ئێوەمان کردە گەلێکی میانەڕەو -لە هەموو ڕوویەکەوە.»

ڕاڤەکارانی قورئان لە مانا و مەبەستی وشەی (وَسَطًا) دا دەڵێن واتە: باش و دادگەر، پاشان دەفەرمویت: ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ «تا ببنە شایەت و گەواهیدەر بەسەر خەڵکییەوە»، ئەمەش واتای بەباشدانانی ئوممەتەکەیە بەشێوەیەکی گشتی.

معاویەی کوڕی حەیدەی قوشەیری (خودا لێی ڕازی بێت.) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)بوو دەیفەرمووو: «إِنَّكُمْ تُوفُون سَبْعِينَ أُمَّةً، أَنْتُمْ خَيْرُهَا، وَأَكرَمُهَا عَلَى اللّٰهِ عَزَّ وَجَلّ»[١]. واتە: «ئێوە دوا ئوممەتن لە کۆی حەفتا ئوممەت کە ئێوە باشترینیانن و بەڕێزترینیانن لای خودای گەورە و باڵادەست.» ئەمەش فەرموودەیەکی سەحیحە و هەریەک لە پێشەوایان ئەحمەد و تیرمزی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە.

کەواتە چۆن ڕێی تێدەچێ ئەم ئوممەتە کە چاکترین و بەڕێزترینی ئوممەتانە لەسەر ناحەق و گومڕاییەک کۆببێتەوە؟

لەڕاستیدا ئەمە تەواو پێچەوانەی ئەو فەزڵپێدان و بەچاکدانانە خوداییەیە بۆ ئەم ئوممەتە.

یەکێک لەو فەرموودانەش کە جێی خۆیەتی لە بابەتی کۆڕدا ئاماژەی

---

(١) مسند أحمد (٢٠٠٢٩)، سنن الترمذي (٣٠٠١)، سنن ابن ماجه (٤٢٨٧، ٤٢٨٨).

پێبدەین: ئەو فەرموودەیەیە کە موسلیم لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی کە ثوبان (خودا لێی ڕازی بێت.) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: «لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الحَقِّ لايَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللّٰهِ وَهُمْ كذلِک»[١]. واتە: «بەردەوام لە ئوممەتی من تاقمێک دەمێنێ کە لەسەر حەقن و سەرکەوتوون تا ڕۆژی دوایی، پشتبەردان و دژایەتی هیچ کەس زیانیان پێ ناگەیەنێت، هەتا ڕۆژی دوایی دێت و ئەوان بەو شێوەیە دەمێننەوە.» ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم ئوممەتە کەسانی حەقبێژی لێ نابڕێت، نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە ڕاڤەی فەرموودەکەدا دەڵێت: "هەروەها بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە کۆڕای زانایان بەڵگەیەکی کارپێکراوە، ئەمەش ساغترین بەڵگەیە بۆی لە فەرموودەدا، بەڵام فەرموودەی «لاتَجْتَمِعُ أُمَّتِي عَلَى ضَلالَةٍ»[٢] «ئوممەتەکەم هەرگیز لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە» (فەرموودەیەکی لاوازە."[٣]

ڕەنگە هەندێک لەوانەی گرفتیان لەگەڵ ئیجماعدا هەیە قایلبن بەوەی ئوممەت لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە، بەڵام ئەوان دەڵێن: هەر لە بنەڕەتدا ناگونجێت ئیجماع ڕووبدات، چونکە زانایان پەرت و بڵاو بوون لەنێو وڵات و ناوچە جیاوازەکان و دیوان و تۆمارێک نەبووە کۆی کردبێتنەوە و قسەو بۆچوونەکانیانی تێدا ژمێردرابێت، لەبەرئەوە پێویست بە باسکردنی دەقەکانی باشییەتی و چاکترین بوونی ئوممەت ناکات.

لەڕاستیدا ئەم قسەیەش ورد و بابەتییانە نییە، چونکە ئەوان جیاوازی لەنێوان کۆڕایەکی بڕاوە» ئیجماعی قەتعی» و کۆڕایەکی گومانهەڵگر

---

(١) صحيح مسلم (١٩٢٠).

(٢) سنن ابن ماجه (٣٩٥٠).

(٣) شرح النووي على مسلم ، دار إحياء التراث العربي (٦٧/١٣).

«ئیجماعی زەننی»دا ناکەن، یان لەنێوان کۆڕایەک کە زانایانی ئیسلام بە جیاوازی مەزهەب و وڵاتەکانیانەوە لەسەر گواستنەوە و دانپێدانانی یەکدەنگ بووبن و ئیجماعێک کە تاکە زانایەکی یەک مەزهەب گواستبێتییەوە، وێڕای هەموو ئەمانەش دەستەواژەکەی ئیمام ئەحمەد دێنن -ئەو زانایەی کە لە بابەتی ئیجماعدا نەبێت نایناسن، بگرە لەوانەیە بە توند و سەختگیریش ناوزەندی بکەن لە بابەتەکانی تردا- کە تێیدا دەڵێت: "ئەوەی بانگەشەی کۆڕ بکا، درۆ دەکات." لەڕاستیدا وەرگرتنی ئەم دەربڕینەی ئیمام ئەحمەد و پشتگوێخستنی دەربڕینەکانی تری لە هەمان بابەتدا بژارکارییەکی نابابەتییانەیە، یاخود نەزانییەکە کە هۆکارەکەی کەم خوێندنەوە و نەبوونی حەزی گەڕانە بەدوای پێچەوانەی ئەم بۆچوونە لای هەمان ئیمام.

بۆیە لەگەڵم بە -خوێنەری بەڕێز- تا هەڵوەستەیەک بکەین لەسەر ئەو دەقانەی تر لە هەمان ئیمام ئەحمەدەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) تاوەکو ئەندازەی ئەو بژارکارییە بزانیت کە هەندێک لە گومانگەرایان ئەنجامی دەدەن، یان ئەو نەزانییەی کە زۆرینەیان تێیدا دەژین:

قازی ئەبو یەعلای حەنبەلی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) دەفەرمووێت: "کۆڕا بەڵگەیەکە قسەی تێدا بڕاوەتەوە و گەڕانەوە بۆی واجبە، سەرپێچیکردنیشی حەرامە، ناگونجێت هەموو ئوممەت لەسەر هەڵە کۆببنەوە ".لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشەوە بەم دەقە هاتووە بە گێڕانەوەی هەریەک لە عەبدوڵڵای کوڕی و ئەبو حارس کە گوتویەتی: «في الصحابة إذا اختلفوا لم يخرج من أقاويلهم، أرأيت إن أجمعوا، له أن يخرج من أقاويلهم؟ هذا قول خبيث، قول أهل البدع، لاينبغي أن يخرج من أقاويل الصحابة إذا اختلفوا»[1] واتە: "لەناو هاوەڵاندا، ئەگەر لەسەر بابەتێک

---

(١) العدة في أصول الفقه، تحقيق د. أحمد المباركي (١٠٥٨/٤ - ١٠٥٩).

ڕاجیاییش هه‌بوو، ده‌رچوون له‌ بۆچوونه‌كانی ئه‌وان ڕه‌وا نییه‌، چ بگات به‌و بابه‌تانه‌ی یه‌كڕا بوون تێیدا، چۆن ده‌گونجێت له‌ قسه‌یان ده‌ربچین؟ ئه‌وه‌ بۆچوونێكی دزێوه‌ و قسه‌ی داهێنانكارانه‌، نابێت له‌ قسه‌ و بۆچوونه‌كانی هاوه‌ڵان ده‌ربچین ئه‌گه‌ر جیاوازیشیان هه‌بوو.)"

هه‌روه‌ها ئه‌بو یه‌علا ده‌فه‌رموێت: "ئه‌حمه‌دی كوڕی حه‌نبه‌ل خۆی بانگه‌شه‌ی ئیجماعی كردووه‌، وه‌ك له‌ گێڕانه‌وه‌ی حه‌سه‌نی كوڕی سه‌وابدا ده‌ڵێت: بۆچوونم له‌ گوتنه‌وه‌ی ته‌كبیراتدا ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌ به‌ره‌به‌یانی ڕۆژی عه‌ره‌فه‌وه‌ ده‌ستپێده‌كات تا كۆتا ڕۆژی (أيام التشريق).[1] پێیان گوت: ئه‌م بۆچوونه‌ت پاڵپشت به‌ چییه‌؟ ئیمام ئه‌حمه‌د گوتی: به‌ كۆڕا، عومه‌ر و عه‌لی و عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعود و عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌باس له‌سه‌ر ئه‌مه‌ بوون."[2]

پێشه‌وا ئه‌بو داودیش -كه‌ قوتابی ئیمام ئه‌حمه‌د بووه‌- له‌ په‌ڕتووكی مه‌سائیلی خۆیدا ده‌فه‌رموێت: "گوێم لێبوو كه‌ به‌ ئیمام ئه‌حمه‌د گوترا: فڵانه‌كه‌س ده‌ڵێت: خوێندنی سووره‌تی فاتیحه‌- له‌دوای پێشنوێژه‌وه‌- ئه‌م ئایه‌ته‌ نایگرێته‌وه‌ ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ﴾ [الأعراف: ٢٠٤] واته‌: «كاتێك قورئان خوێندرا، گوێی بۆ بگرن و دڵی بده‌نێ.»

ئه‌حمه‌د فه‌رمووی: ئه‌م قسه‌یه‌ی له‌كوێوه‌ هێناوه‌؟ كۆڕای خه‌ڵك -له‌ هاوه‌ڵان و شوێنكه‌وتووان- له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌باره‌ی نوێژه‌وه‌یه‌."[3]

ئه‌مه‌ی ڕابورد ده‌قێكی ئاشكرا و جێگیر بوو له‌ ئیمام ئه‌حمه‌ده‌وه‌ كه‌ تێیدا بانگه‌شه‌ی كۆڕا ده‌كات له‌ بابه‌تێكی شه‌رعیدا، ئایا ئه‌و ده‌سته‌واژه‌یه‌ی

---

(١) بڕوانه: مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني (ص ٨٨)، ورواية ابنه عبدالله (ص ١٢٩-١٣٠)، ومسائل الإمام أحمد وإسحاق بن راهوية (٢١٧٢/٥).

(٢) العدة (١٠٦٠/٤).

(٣) مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني، مكتبة ابن تيمية (ص ٤٨).

ASTANA

لەسەر جێبەجێ بکەین کە دەفەرموویت: "ئەوەی بانگەشەی کۆڕا بکات، درۆ دەکات." یان هەوڵی تێگەیشتنی بدەین بەو شێوەیەی لەگەڵ بەرجەستەکردنەکانی خۆیدا یەکدەگرێتەوە؟"

هەروەها بۆچی پشت بە تەنیا یەک دەستەواژەی ئەو دەبەسترێت و قسەکانی تری وەلا دەخرێن؟

خۆ ئەگەر بابەتەکە بە بژارکاری بێت، ڕەنگە کەسێکیش بڵێت: من دەمەوێت ئەو دەربڕینەی هەڵبژێرم کە سەلماندنی ئیجماعی تێدایە و ئەو دەربڕینەیان هەڵدەوەشێنێتەوە کە تێیدا بانگەشەی ئیجماع بە درۆ لەقەڵەم دەدات!

گومانی تێدا نییە کە پەیڕەوی پەسەندیدەی زانایان کە لە مامەڵەیان بەرانبەر ئەم دەربڕینەی ئیمام ئەحمەد کاریان پێ کردووە بریتییە لە ئاڕاستەگیری دروست بۆی و تێگەیشتن لێی لەژێر ڕۆشنایی جێبەجێکردن و بەرجەستەکردنەکانی خۆی و وتە و بۆچوونەکانی دیکەی، نەک پشت پێ بەستنی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیجماع!

یەکێک لەو ئاڕاستەگیرییانەی زانایان بۆ وتەکەی ئیمام ئەحمەد ئاماژەیان پێ کردووە ئەمەیە: ئیمام ئەحمەد ئەم قسەیەی لە نکووڵی فەقیهەکانی موعتەزیلەدا فەرمووە، هەروەک مەرداوی- کە یەکێک لە گەورە زانایانی فیقهی حەنبەلییە -لە پەڕتووکی) التحبير(دا ئاماژە بەم وتەیەی ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی دەکات کە لە کۆتایی شەرحی (سنن الترمذي)دا گوتویەتی: "ئەوەش کە لە ئیمام ئەحمەدەوە گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی" هەرکەس بانگەشەی کۆڕا بکات درۆی کردووە" ئەوە لە نکوڵی فەقیهەکانی موعتەزیلەدا گوتوویەتی، کە بانگەشەی کۆڕایان دەکرد لەسەر بۆچوونەکانی خۆیان، لەکاتێکدا کەمترین زانیارییان لەبارەی وتەی هاوەڵان

و شوێنکەوتووانەوە هەبوو."[١]

ئەوەی زیاتر ئەم تێگەیشتنە پشتڕاست دەکاتەوە تەواوکەری قسەکەی ئیمام ئەحمەد خۆیەتی کە لە گێڕانەوەکەی عەبدوڵڵای کوڕیدا دەفەرمووێت: (من ادعى الإجماع فقد كذب، لعل الناس قد اختلفوا، هذه دعوى بشر المريسي والأصم)[٢] واتە: "ئەوەی بانگەشەی کۆڕا بکا، درۆی کردووە، لەوانەیە خەڵکی ڕاجیاییان هەبووبێت، ئەوە بانگەشەی بشری مەریسی و ئەصەممە".

بشری مەریسی[٣] و ئەسەمیش[٤] لە سەرانی بیدعەکاران بوون لە سەردەمی ئیمام ئەحمەددا، ئەم وتەیەی ئیبن تەیمییەش (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بابەتەکە ڕوونتر دەکاتەوە کە دەفەرمووێت: "لەڕاستیدا فەقیهەکانی ئەهلی کەلام وەک مەریسی ئەسەم بانگەشەی کۆڕا دەکەن لەکاتێکدا تەنیا قسە و بۆچوونی ئەبو حەنیفە و مالیک و هاوشێوەکانیان دەزانن و ئاگاداری قسەی هاوەڵان و شوێنکەوتوان نین."[٥]

---

(١) التحبير شرح التحرير في أصول الفقه، للمرداوي، مكتبة الرشد (١٥٢٨/٤).

(٢) العدة في أصول الفقه (١٠٥٩/٤).

(٣) بشر کوڕی غیاسی کوڕی ئەبو کەریمەی مەریسییە، نازناوی (أبو عبد الرحمن) بووە، فەقیهێکی حەنەفی بووە لە ئەهلی کەلام، زانستی فیقهی لە قازی ئەبو یوسفی حەنەفی وەرگرتووە، بەڵام بە زانستی کەلام کاریگەر بووە و ڕچەشکێنی بۆچوونی «خەلقی قورئان» بووە و لەوبارەوە قسەگەلێکی ناپەسەندی لێوە گێڕدراوەتەوە، لەسەر ڕێچکەی مورجیئەش بووە -کە کردەوەیان نەدەخستە پێناسەی ئیمانەوە-، پێی وابوو سوجدەبردن بۆ خۆر و مانگیش کوفر نییە بەڵکوو هێمایەکی کوفرە، یەکێک لەوانە بوو کە مونازەرەی ئیمامی شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت.) دەکرد، شارەزایی لە زانستی نەحودا نەبووە و ئەمەش لە لاری و شێواوی زمانی قسەکردنیدا ڕەنگی دابووەوە. (سەرچاوە: وفيات الأعيان، لابن خلكان، دار صادر (٢٧٧/١) ).

(٤) عبدالرحمن کوڕی کیسان ناسراو بە (أبوبكر الأصم)ی موعتەزیلی، خاوەنی (مقالات فی الأصول)، قازی عبدولجەببار بە یەکێک لە فەقیهانی موعتەزیلە هەژماری کردووە. (سەرچاوە: لسان الميزان، ت: أبی غدة، دار البشائر الإسلامية).

(٥) المسودة في أصول الفقه، دار الكتاب العربي (٣١٦).

ئیبن قەییمیش (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) قسەیەکی نزیک لەمەی هەیە کە دەفەرمووێت: ”مەبەستی ئیمام ئەحمەد لەم قسەیە بەدوورزانینی بوونی کۆڕا نییە، بەڵام ئەحمەد و پێشەوایانی فەرمووده دووچاری بەڵای ئەو کەسانە بووبوون کە سوننەتی سەحیحیان ڕەتدەکردەوە بە ناوی هەبوونی کۆڕا لەسەر پێچەوانەی ئەوەی لە سوننەتدا هەیە، بۆیە شافیعی و ئەحمەد ڕوونیانکردەوە کە ئەو بانگەشەیە درۆیە و نابێت حوکمەکانی سوننەت بەو چەشنە بانگەشانە ڕەتبکرێنەوە.“[1]

یەکێکی تر لە ئاڕاستەگیرییە دروستەکان بۆ وتەکەی ئیمام ئەحمەد ئەوەیە: کە لەڕووی (وەرع) و خۆپارێزییەوە لە بانگەشەکردنی کۆڕادا فەرموویەتی، بەو واتایەی بانگەشەی کۆڕا کارێکی قورسە، چونکە ڕەنگە ڕایەکی جیاواز هەبێت بانگەشەکاری کۆڕا پێی نەگەیشتبێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئیمام ئەحمەد ڕێنمایی زانایانی دەکرد بۆ بەکارهێنانی دەستەواژەی: (لا أعلم فيه خلافاً) واتە: ”ئاگاداری بوونی ڕاجیایی نیم تێیدا.“ یان هەر دەستەواژەیەکی تری هاوشێوە، چونکە ئەوە نزیکترە لە واقیعەوە، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە هیچ زانایەک بانگەشەی کۆڕا نەکات ئەگەرچی ئاگاداری قسە و بۆچوونی هەموو زانایانیش بێت لەبارەی بابەتێکەوە و دڵنیا بێت لە هەبوونی کۆڕا تێیدا، وەک چۆن ئیمام ئەحمەدیش خۆی ئەو کارەی کردووە.

هەروەک قازی ئەبو یەعلا (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە پەڕتووکی (العدة)دا دەفەرمووێت: ”ڕواڵەتی ئەم قسەیە وا دەبینرێت کە ئەحمەد ئیجماعی بە ڕاست دانەنابێت، وەلێ بەو چەشنە نییە کە لە ڕواڵەتدا دەبینرێت، بەڵکوو تەنیا لە ڕووی خۆپارێزی و وەرعەوە ئەمەی گوتووە، بەهۆی ئەگەری بوونی ڕایەکی جیاواز کە ئەم پێی نەگەیشتبێت، یاخود

---

(١) بڕوانە: مختصر الصواعق المرسلة (لاپەڕە ٥٨٣).

ئەمەی لە هەقی کەسانێکدا وتووە کە هیچ زانست و ئاگادارییەکیان نییە لەمەڕ ڕاجیاییەکانی پێشین."[1]

پاشان دەگەڕێمەوە و دەڵێم: زۆرینەی ئەوانەی گرفتیان لەگەڵ کۆڕادا هەیە جیاوازی ناکەن لەنێوان ئاستەکانی کۆڕا و ناچوونیەکییان لە ڕووی بەهێزی و لاوازییەوە، ئاخر ئەو کۆڕایەی کە دەبینیت زانایان لەسەر گواستنەوەی هاودەنگن بە حەنەفی و مالیکی و شافیعی و حەنبەلی و زاهیرییانەوە، دوای بەدواداچوونیش هیچ دەق و بۆچوونێک لە زانایەکی جێباوەڕەوە نەزانراوە کە پێچەوانەی بووبێت، ناگونجێت لەبارەیەوە بگوترێت: چۆن زانییان کۆڕا دروستبووە، لەوانەیە زانایان ڕاجیاییان هەبێت؟

بۆ مەگەر زانایان کێن بێجگە لەوان؟

چ بگات بەوەی ئەو کۆڕایە پشت ئەستوور بێت بە دەقی فەرموودەی ساغ و سەلمێنراو کە ئاماژەی ئاشکرا بەدەستەوە بدات لەمەڕ ئەو بابەتەی کۆڕای لەسەر هەیە؟

وەک فەرموودەکانی ڕەجم -ڕەجمکردنی پیاو و ئافرەتی زیناکاری هاوسەردار- بۆ نموونە، کە فەرموودەگەلێکی سەحیحن و گومان لە سەحیحێتییاندا نییە، پاشان زانایانیش هاودەنگ بوون لەسەر گواستنەوەی کۆڕا لەسەر ئەو سزا شەرعییەی کە لەو فەرموودانەدا هەیە، ئەم جۆرە کۆڕایە بڕاوەیە و پاڵپشت بە دەقی شەرعییە، لەڕاستیشدا کۆڕاکە هاتووەتەدی، بەڵام گرفتی ئەو ڕەخنەگرە هاوچەرخانە لەوەدایە کە لایان ئاساییە بەبێ لێکۆڵینەوەی تەواو لەمەڕ هەر بابەتێک بدوێن و بەبێ جیاوازیکردنیش لەنێوان جیاوازەکان.

---

(١) العدة (٤/١٠٦٠).

# بەشی سێیەم

## تێگەیشتن لە ئیسلام

- ئایین بە تێگەیشتنی کێ؟
- لەنێوان دەقەکانی شەریعەت و ئامانجەکانیاندا
- بۆچی زانایان ڕاجیا دەبن؟
- حەقیقەت لای کێیە؟

## ئایین بە تێگەیشتنی کێ؟

هیچ کەسێک بە موسڵمان هەژمارناکرێت تا باوەڕ نەهێنێت بەوەی قورئان داهێنراوی مرۆڤێک نییە، بەڵکوو تەنیا لەلای خودای گەورەیە و هەرچیشی تێدایە حەق و ڕاستییە، سوپاس بۆ خودا لە بەشەکانی پێشوودا بەڵگەکانمان لەسەر ئەم بابەتە بەڕوونی باسکرد.

ئەمە پرسێکە هیچ ناکۆکییەکی لەسەر نییە لەنێوان ئەوانەی خۆیان بە شوێنکەوتەی ئیسلام دادەنێن، بەڵام دیاردەیەک هەیە هەندێکیانی لەخشتەبردووە، بە جۆرێک کە لەڕێیەوە خۆیان لەو ڕاستییەی پێشوو دەپەڕێننەوە بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا خۆیشیان لە قورئان دابڕنن، ئەویش دیاردەی خوێندنەوەی کراوەیە بۆ دەقی قورئانی، بۆیە دەبینیت کە دەڵێن: ئێمە باوەڕمان بە قورئان هەیە، بەڵام باوەڕمان بە تێگەیشتنەکەی تۆ نییە بۆ قورئان، یان تێگەیشتنی زانایانی پێشوو یاخود هاوچەرخ، وابەستەی تێگەیشتنی هیچ یەکێک لە موسڵمانانیش نابین، بەڵکوو بۆ هەر یەکێک لە ئێمە خوێندنەوە و تێگەیشتنی تایبەت بە خۆی هەیە لە دەقی قورئانی، چۆن بیەوێت لێی تێدەگات بێئەوەی هیچ لایەک تێگەیشتنی ئەوی تر بە هەڵە دابنێت، بەم پێیە هیچ تێگەیشتنێکی پابەندکەر بوونی نییە، یان- ڕاستتر بڵێین- : ئیسلامێکی دیاریکراوی پابەندکەر بوونی نییە!

بیرمە کاتێک لەگەڵ یەکێک لەوانە وتووێژم دەکرد، پێم گوت: حوکمی زیناکردن چییە لە قورئاندا؟ گوتی: ”حەرامییەتی“، منیش گوتم: باشە ڕات چییە ئەگەر کەسێک بێت و بڵێت: ”بە تێگەیشتنی من لە دەقە قورئانییەکا، زیناکردن حەرام نییە، تەنیا ئەگەر بە زۆرەملێ -اغتصاب - بێت

حەرامە؛ ئەوکات ڕات چییە لەسەر قسەکەی؟ گوتی: بە هەڵەی دانانێم!

بینیتان خۆدزینەوە لە ئیسلام چۆنە لە ڕێگەی خۆ هەڵخەڵەتاندنەوە؟!

یەکێکی دیکەشیان دەڵێت: ”لە جیهانی مرۆڤایەتیدا هیچ پەسەندکاری و باشترێتییەک بوونی نییە لەنێوان ڕێسایەکی خودایی و ڕێسایەکی مرۆڤکرد، چونکە هەر یاسا و ڕێسایەک کە مرۆڤ بیگرێتەدەست، تەنانەت گەر پشتبەستووش بێت بە شەریعەتێکی خودایی هەر دەبێتە مرۆیی و هەوا و ئارەزووەکانی مرۆڤ و لایەنگیری و پڕکێشی و هەموو ڕەهەندە لاوازەکانی ئەوی تێدا ڕەنگدەداتەوە.“

هەر بۆیە دەبینیت کە ئەوان دەڵێن: شتێک نییە بە ناوی حوکمکردن بە قورئان، قورئان بۆ ئەوە دانەبەزیوە کە حوکم بکات!

خۆ ئەگەر تێگەیشتن لە بابەتەکە بەم جۆرە بێت، کەواتە بۆچی خوا فەرمانمان پێ دەکات بە گێڕانەوەی ناکۆکییەکان بۆ لای قورئان، وەک دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ زانراویشە کە گەڕانەوە بۆ خودا واتە گەڕانەوە بۆ لای پەڕتووکەکەی، گەڕانەوە بۆ پێغەمبەریش (ﷺ)گەڕانەوەیە بۆلای سوننەت و ڕێبازەکەی، هەروەک زانایانی موسڵمان لەسەری یەکدەنگن، لەو زانایانەش کە کۆڕایان لەسەر ئەمە گواستووەتەوە: ئیبن قەییم لە پەڕتووکی (إعلام الموقعين) و پێش ئەویش ئیبن حەزم کۆڕای لەسەر ئەوە گواستووەتەوە کە ڕووی دواندن لەم ئایەتەدا لە ئێمە و هەر موسڵمانێکیشە تا ڕۆژی دوایی، هەروەها ئایەتەکە ئەوەشی لێ وەردەگیرێت کە ئەگەر داوەری ببەینەوە لای قورئان و سوننەت لەوێدا یەکلاکەرەوەی ناکۆکییەکان دەدۆزینەوە، لەکاتێکدا ئەگەر بە تێگەیشتنەکەی ئەوان - بانگەشەکارانی تێگەیشتنی کراوە بۆ دەقەکان- بێت گەڕانەوەمان بۆ قورئان و سوننەت ناکۆکیمان زیاتر دەکات؛ چونکە هەر مرۆڤێک تێگەیشتنی خۆی هەیە و هیچ یاسا و ڕێکخستنێکیش نییە

بۆ تێگەیشتن لە دەقەکان!

لێرەدا بەوان دەڵێین: ئایا هیچ ڕاستییەک لە قورئاندا بوونی هەیە کە لەسەر هەمان تێگەیشتن بۆی کۆک بین؟

ئەگەر گوتیان: نەخێر، دەڵێین: کەواتە قورئان بۆچی دابەزێنراوە؟ مەگەر بۆ ئەوە دانەبەزیوە کە ببێتە (حوججە) بەڵگەی بیانوبڕی خودا بەسەر بەندەکانییەوە؟ ئەی بەم پێیە بێت ئەگەر خودای گەورە وازی لە مرۆڤەکان بهێنایە بەبێ ناردنی قورئان چ زیانێکیان دەکرد، خۆ قورئان هیچ حەقیقەتێکی نوێی نەهێنا؟ ئەی لەبەرچی خودای گەورە چاکە و منەتی خۆیمان بیردەخاتەوە بە ناردنی ئەم پەڕتووکە ڕەوان و ڕێنوێن و ئامۆژگارییە؟ بۆچی خودای گەورە وەسفی دەکات بەوەی پەڕاوێکە مرۆڤەکان لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕۆشنایی دەبات؟ ﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦﴾

واتە: «بێگومان لەلایەن خوداوە ڕووناکییەک و نامەیەکی ئاشکرا و ڕوونتان بۆ هاتووە، خودا ڕێنوێنی کەسێکانێکی پێ دەکات کە شوێن ڕەزامەندی ئەو بکەون بەرەو ڕێگەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی و لە تاریکاییەکانی شیرک و بێباوەڕی دەریاندەهێنێت بەرەو ڕووناکیی ئیمان و ڕێنوێنیانیان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست.»

ئەگەر گوتیشیان: بەڵێ، حەقیقەتگەلێکی تێدایە، بەڵام لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕناکات، وەک -تەوحید- یەکخواپەرستی و نوێژ و زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجکردن، ئەوکات پێیان دەڵێین: بە چ پێوەرێک ئەم بابەتانەتان بە حەقیقەتگەلێک دانا کە لە قورئاندا مانا و مەبەستەکەیان ڕوونە و هاوڕاییان لەسەر هەیە؟

بەدڵنیاییەوە ناشێت پێوەرەکەتان ئەو کۆڕایە بێت کە لای زانایان زانراوە، چونکە ئەوان لەسەر حوکمگەلێکی دیکەی زیاتریش لەوەی ئێوە باسی دەکەن کۆڕایان هەبووە، وەک حوکمی پووچییەتی و ناڕەوایی هەر ئایینێک جگە لە ئایینی ئیسلام و حەڕامییەتی سوخۆری (ڕیبا) و زیناکردن و قسەکردن لە فەرمانی خودادا بەبێ زانست و هتد، هەروەها خۆ دەستوەردانی ئێوە لە دیاریکردنی تێگەیشتنی پەیوەست بەم چەند حوکمەوە لەپێشتر نییە لە ئیجماعی زانایان لەسەر حوکم و ڕێساگەلێکی قورئانی زۆر، لەکاتێکدا ئەوان شارەزا و تایبەتمەندی بوارەکەشن.

پاشان، ئەگەر هەر کەسێک خوێندنەوە و تێگەیشتنی تایبەتی خۆی هەبێت و نەتوانین هیچکامێکیشان بە هەڵە دابنێین؛ کەواتە بۆچی ئەوانەی بانگەشەی خوێندنەوەی کراوە بۆ دەق دەکەن هەندێک لە خوێندنەوەکانی دیکە بە هەڵە دادەنێن؟ وەک دەبینین لە هەڵسەنگاندنیاندا بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتنی هەندێک لە «ڕەوت و زانا» ئیسلامییەکان بۆ قورئان بە زیادەڕەوی و ڕۆچوون لە تێگەیشتنی دەقدا وەسفیان دەکەن.

لەسەر چ بنەمایەک تێگەیشتنی میانەڕەویان دیاریکرد تا بڕیار لەسەر ئەوانی تر بدەن بە زیادەڕەوی و سەختگیری؟ مەگەر خۆیان نەیانگوت دەرگای خوێندنەوەکان واڵایە؟ کەوایە با هەرکەسێک خوێندنەوەی خۆی هەبێت، هەریەک بەو جۆرەی دەیەوێت تێبگات، ڕەخنەش لە کەس مەگرن و پابەند بن بە بنەما و پرەنسیپەکانتانەوە.

## تێگەیشتنی دروست:

لەڕاستیدا خودای گەورە قورئانی بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و پاراو دابەزاندووە، بۆیە ڕەوا نییە بە شێوەیەک ڕاڤەی قورئان بکەین لە دەرەوەی ئەوە بێت کە زمانی عەرەبی ڕەوان پێویستی دەکات لە واتا و لە میان و سیاقی دەقەکان، هەروەها بەشێک لە قورئان بە بەشێکی تری تەفسیر دەکرێتەوە، هەندێکجار دەبینیت ئایەتێکی کورتبێژ) موجمەل( ئایەتێکی دیکەی ڕوونبێژ) موفەصەل( ڕاڤەی دەکاتەوە، یاخود ئایەتێک کە فرەڕاڤەیە (موتەشابیهـ) ئایەتێکی دیکەی دامەزراو (موحکەم) ڕوونی دەکاتەوە، هەر بۆیەش زانایان بایەخێکی زۆریان داوە بە ڕاڤەکردنی قورئان بە قورئان.

پاشان گومانی تێدا نییە پێغەمبەری خودا (ﷺ)لە سوننەتەکەیدا زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئانی ڕوونکردووەتەوە، بۆیە یەکێک لە گوزارشتەکانی تێگەیشتنی ڕاست بۆ قورئان ئەوەیە کە لەژێر ڕۆشنایی سوننەتی گەیەنەری پەیامەکەدا بێت (ﷺ)، چونکە زۆرینەی فەرمانە پوخت و کورتبێژەکانی ناو قورئان وەک فەرمانکردن بە ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتدان، وردەکارییەکانیانمان لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە پێ گەیشتووە، ناشگونجێت هیچکام لەو فەریزانە ئەنجامبدرێن تەنیا بەو جۆرە نەبێت کە پێغەمبەری خودا (ﷺ)ڕوونی کردووەتەوە.

هەروەک گومانیشی تێدا نییە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) شارەزاترینی خەڵک بوون لە زمانی عەرەب و هاوسەردەمی دابەزینی قورئانیش بوون، وێڕای ئەوەی هاوەڵی و هاودەمی پێغەمبەری خوداشیان کردبوو، هەموو ئەمانە لێوەشاوەیی ئەوەیان پێدەدات کە تێگەیشتووترینی خەڵکی بن لە قورئان، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە دوای هاوەڵان چیتر پێویستییەک بۆ تەفسیر و تێگەیشتن لە قورئان نەماوە، چونکە ئەوە

قسەیەکی پووچە، بەڵکوو مەبەست لەوەیە گرنگی بدەین بە قسە و بۆچوونە جێگیرەکانیان لە ڕاڤەکردنی قورئاندا و پلەوپایە و بایەخی شایستەیان پێ بدەین و ڕاڤە و تێگەیشتنەکانی ئەوان نەدەین بە دیواردا.

دامەزراو و فرەڕاڤە (موحکەم و موتەشابیهـ) لە قورئاندا:

خودای گەورە خۆی ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە لە ئایەتەکانی قورئاندا تیایاندایە واتاکەی دامەزراوە و تیاشیاندایە فرەڕاڤەیە (موتەشابیهـ(، کە دەفەرمووێت: {هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ } [آل عمران: ٧]

واتە: «ئەو خودایە زاتێکە ئەم قورئانەی دابەزاندە سەرت، بەشێک لە ئایەتەکانی دامەزراو و ئاشکران کە بنەڕەتی پەڕتووکەکەن، هەندێکی تریشیان لێکچوون و واتای هەمەجۆر هەڵدەگرن.»

پێشەوای ڕاڤەکارانی قورئان (الطبری) لە باسی جیاوازی نێوان ئایەتی موحکەم و موتەشابیهدا دەڵێت: "ئایەتە دامەزراوەکان -المحکمات- ئەوانەن کە لە لێکدانەوە و تەفسیردا لە یەک لێکدانەوە زیاتر هەڵناگرن، ئایەتە فرەڕاڤەکانیش -المتشابهات- ئەوانەن کە چەند ڕاڤەیەک هەڵدەگرن."(١)

هەروەها شێخ عەبدوڵڵا عوجەیری لە پەڕتووکە پڕبایەخەکەیدا بە ناوی (ینبوع الغواية الفكرية) دەڵێت: "هەموو بەرنامە و ڕێبازێک چەند بیرۆکەیەکی بنەڕەتی و تەوەرەیی هەیە کە گوزارشت لە جێگیر و بنەما نەگۆڕەکانی ڕێبازەکە دەکات، هەر کەسێکیش لەو بنەمایانە هەڵبگەڕێتەوە، بەدڵنیاییەوە بە دەرچوو لە سنووری ڕێبازەکە لەقەڵەم دەدرێت، وەک چۆن ناگونجێت کەسێک کە بانگەوازی هەڵوەشانەوەی ئازادییەکان

---

(١) جامع البيان، للطبري، مؤسسة الرسالة (٢/٢١٣).

دەکات لیبڕالی بێت، یان ناشێت ئەو کەسەی داوای هەڵوەشانەوەی بۆ گەڕاوەیی گەل لە دەسەڵاتدا بکات دیموکراتخواز بێت، بە هەمان شێوە بۆ ئیسلامیش دەڵێین: کە ڕشتەبەندی و- مەنزومەیەکی- تەشریعی ڕوون و دامەزراوی هەیە و ناکرێت کەسەکە لێی دەربچێت و لە هەمان کاتدا بانگەشەی موسڵمانێتیش بکات."[١]

لەم باسەدا وەڵام بۆ ئەوانە هەیە کە دەڵێن: هیچ تێگەیشتنێک بۆ دەقەکان بوونی نییە کە بتوانرێت حوکمی ڕاستییەتی یان هەڵەیی لەسەر بدرێت، هەروەها وەڵامی کەسانێکیش کە دەڵێن: هیچ حەقیقەتگەلێک لە قورئاندا بوونی نییە کە هاوڕایی لەسەر بێت یان پێویست بکات هاوڕایی لەسەر هەبێت.



---

(١) ينبوع الغواية الفكرية، الناشر: مجلة البيان (٢١٠).

## لەنێوان دەقەکانی شەریعەت و ئامانجەکانیاندا

زۆرێک لە خەڵکی لە تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام دەکەونە هەڵەوە کاتێک لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ئامانجەکان (مەقاسیدی شەریعەت) بەهەند وەرناگرن، ئامانجەکانی شەریعەتیش پێناسەکراوە بەوەی: ئەو مەبەست و دانایی و حیکمەتانەیە کە یاسادانەر خودا. ڕەچاوی کردوون لە دانانی ڕێسا و حوکمەکان.

هەروەک پێناسەش دەکرێت بەوەی: ئەو مەبەست و ئامانجانەیە کە یاسادانەر -خودا- ویستی بەدیهاتنیانی هەیە لە ڕێگەی حوکمە شەرعییەکانەوە.

لە نموونەی ئامانجەکانی شەریعەت:

ئامانجی پاراستنی پێنج پێویستە) ضروريات الخمس (کە بریتین لە: دین، نەفس -خودی مرۆڤ-، وەچە، عەقڵ، ماڵ و سەروەت.

ئامانجی کۆبوونەوەی گوتەی باوەڕداران نەبوونی دووبەرەکی لەنێوانیاندا.

ئامانجی ڕێگری لە ستەم و بەدیهێنانی دادگەری.

هەتاکوو مرۆڤ زاناتریش بێت بە دەقە شەرعییەکان، لێهاتوویی زیاتر دەبێت بۆ تێگەیشتن لە ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی، چونکە ئەو ئامانجانە لەسەر دەقەکانی قورئان و سوننەت بنیاتنراون، زۆرینەشیان لەسەر دەقێک یان دووان بنیاتنەنراون، بەڵکوو لەسەر کۆمەڵێک لە دەقەکان، بۆیە هەڵەیە کەسێک گومانی وا بێت کە دەکرێت لە ڕێگەی پێناسە گشتییەکان و قاڵب و داڕشتە ئامادەکراوەکانەوە لە ئامانجەکانی شەریعەت تێبگەین، چونکە بەبێ ئاگاداربوون لە بابەتە بەشییەکان (جوزئییات) ئەستەمە لە پرسە گشتییەکان (کوللییات) تێبگەین.

یەکێک لە گرنگترین هۆکارە یارمەتیدەرەکان بۆ تێگەیشتنێکی دروست لە ئیسلام بریتییە لە: زانینی ئەوەی کە ئامانجەکانی شەریعەت لە ڕووی گرنگی و لەپێشینەییەوە ئاست و پلەبەندییان تێدایە و هەندێکیان پێش هەندێکی تریان دەخرێن لەکاتی کەڵەکەبوونیان و ناگونجێت ئامانجێکی لەخوارتر بەسەر ئامانجێکی سەرووتردا پێشبخرێت، بە نموونە لە شەریعەتدا ئامانجی پاراستنی ئایین پێشخراوە بەسەر ئامانجی پاراستنی نەفسی مرۆڤ، هەر لەبەر ئەوەشە جیهاد و جەنگان لەپێناوی خودا لە شەرعدا دانراوە، کە کارێکە گیانی مرۆڤ تێیدا دەبەخشرێت لەپێناو بەدیهاتنی ئامانجە گەورەکە کە پاراستنی ئایین و بەرزڕاگرتنی وتەی خوایە.

بۆیە لەڕاستیدا ئەوەی دەستەبەری سەلامەتی قیبلەنمای تێگەیشتنمان دەکات لە بارەی ئیسلام بە گشتی و ئامانجەکانی شەریعەت بە تایبەتی، تێگەیشتنمانە بۆ دەقەکان و ئامانجەکان لەسەر بنەمای لەپێشینەیی ئەو ئامانجەی لەپێناویدا خوڵقێنراوین و هەر لەپێناوی بەدیهاتنی ئەو ئامانجەشدا خودای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە کە ئەویش: عیبادەت و پەرستشی خودای تاک و تەنیا و بێهاوەڵ، وەک دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾ [الذاريات: ٥٦]

واتە: «من جنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردوون تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.»

لێرەدا جێی خۆیەتی دەستەواژەکەی مامۆستای زانستی مەقاسید (الشاطبی) بە ئاوی زێڕ بنووسینەوە کە دەفەرمووێت: (الشارع إنما قصد بوضع الشريعة إخراج المُكلّف عن اتباع هواه حتى يكون عبْداً لله)[١] واتە: «دانەری شەرع ئامانجی لە دانانی شەریعەت تەنیا دەرهێنانی مرۆڤەکانە لە شوێنکەوتنی ئارەزوویان تا ببنە بەندەی ڕاسڵی خودا.»

---

(١) الموافقات للشاطبي (١-٢/ ٤٥٧ ط. الرسالة).

ASTANA

ئەم ئامانجەش کە بەدیهاتنی بەندایەتییە بۆ خودای گەورە تایبەتترین ئامانجی شەریعەتی ئیسلامە کە لە گشت ئایینە زەمینی و ڕێبازە مرۆڤکردەکان جیای دەکاتەوە. بۆیە لە ڕاستیدا هەڵەیەکی گەورەیە لەکاتی باسکردنی ئامانجەکانی شەریعەت بێین تەنیا لەبارەی ئەو ئامانجە هاوبەشانەوە بدوێین کە لەنێوان شەریعەتی ئیسلام و ڕێبازە زەمینی و مرۆڤکردەکاندا هەیە، وەک جەختکردنەوە لە دوو ئامانجی: دادگەری و ئازادی، لەبەرانبەردا فەرامۆشکردنی ئەو ئامانجانەی کە ئیسلام لەوانی دیکە جیادەکاتەوە.

هەندێک لە موسڵمانانیش لە ڕووی جەختکردنەوەیانەوە لەسەر برەودان بە خاڵە هاوبەشەکانی نێو مرۆڤایەتی بێئاگا دەبن لەم ڕاستییە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە برەودان بە خاڵە هاوبەشەکان نابێت لەسەر حسابی شێواندنی ئەو پرسانە بێت کە تایبەتن بە ئیسلام و لە ڕێبازەکانی تر جیای دەکەنەوە.

بە کورتی، زانینی ئامانجەکانی شەریعەت و فیقهـ و تێگەیشتوویی لە دابەزاندنیان بۆ سەر واقیع، هەروەها ڕەچاوکردنی ڕیزبەندییان لە ڕووی گرنگییەوە لە کاتی کەڵەکەبوونیان، لە گرنگترین ئەو هۆکارانەن کە یارمەتیمان دەدەن بۆ تێگەیشتنێکی دروست لە ئیسلام.

ئەمەش تەنیا بە خوێندنەوەی پەڕتووکێک یان دوو پەڕتووک لە زانستی مەقاسید و بەبێ بوونی بناغە و پاشخانێکی زانستی شەرعی بەدەستنایەت، بەوپێیەی قۆناغی تێگەیشتن لە ئامانجەکانی شەریعەت تەنیا لە دوای هەبوونی زانست بە دەقەکانی شەریعەت و ڕێساکانی تێگەیشتن لێیان دەبێت کە لەنێو پەرتووکەکانی زانستی بنەماکان(أصول الفقه)دا هەن.

## بۆچی زانایان ڕاجیا دەبن؟

ئەگەر ئایینەکە ڕوون و ئاشکرایە، کەوایە بۆچی زانایان ڕاجیاییان تێدەکەوێت؟ هەڵوێستی ئێمە چۆن بێت لەم ڕاجیاییە؟

ئەمانە دوو پرسیارن کە بەردەوام لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و کۆڕبەندە هزری و ئێوارە کۆڕەکانی لاواندا دەخرێنە بەرباس، بەر لەوەی هۆکارەکانی دروستبوونی ڕاجیایی و خیلاف لەنێو زانایاندا بخەینەڕوو، پێم باشە سەرەتا ڕوونکردنەوەیەک لەبارەی ئەو هەڵەیەوە بدەم کە زۆرێک لە خەڵکی ئەنجامی دەدەن لە مامەڵەیان لەگەڵ بۆچوونە فیقهییەکان، ئەویش بە بژارکاری (ئینتقائییەت) لەنێو وتە و بۆچوونە فیقهییەکان ،بەڵام لەسەر بنەمای نزیکییان نا لە بەڵگەوە، بەڵکوو بەپێی ئەندازەی تەبایی بۆچوونە فیقهییەکە لەگەڵ ئەوەی کەسی هەڵبژێر دەیەوێت و ئارەزووی دەکات، بۆیە لەنێو قسەکانی زانایەکدا تەنیا قسەی پەسەندکراو و دڵخوازی خۆی هەڵدەبژێرێت، ئیتر زۆرینەی قسە و بۆچوونەکانی تری هەمان ئەم زانایە ڕەتدەکاتەوە لە بوارەکانی تردا، پێوەری وەرگرتن و ڕەتکردنەوەشی تەنیا ڕادەی نزیکی بۆچوونەکەیە لە ئارەزوو و خواستی خۆیەوە!

خۆ ئەگەر لەم هەڵبژاردنەدا لەگەڵی ناکۆک بیت، ئەوە دەکاتە بەڵگە کە بابەتەکە ڕاجیایی تێدایە، وا گومان دەبات کە تەنیا بوونی ڕاجیاییەکە مۆڵەتێکە بۆی تا بە خواستی خۆی لەنێو بۆچوونەکاندا هەڵبژێرێت!

بێگومان ئەم کارەش تەنیا گوزارشتە لە کردەیەکی پێکەوەلکاندن و کۆکردنەوە و لە کۆتاییدا وێنەیەکی ناتەبا لەگەڵ شەرع پێکدێنێت کە هیچ یەک لە زانایان لەگەڵی نەبوون و نەیانویستووە بەم جۆرە کۆکردنەوەیە مامەڵە لەگەڵ بۆچوونەکانیاندا بکرێت.

لەبارەی ئەم کۆکردنەوە و بژارکارییەوە پێشەوا ئیبن عەبدولبەڕ

(ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) کە لە زانایانی فیقهی مالکییە دەڵێت: (الإختلاف ليس بحجة عند أحد علمته من فقهاء الأمة إلا من لا بصر له، ولا معرفة عنده، ولا حجة في قوله)[١] . واتە: ((ڕاجیایی بەڵگە نییە -بۆ سەرپشکبوون لەنێوان ڕاکان- لای هیچکام لەوانەی من زانیبێتم لە فیقهزانانی ئوممەت، مەگەر لای کەسێک کە بێئاگا بێت و زانستی پێ نەبێت و قسەی بێبەڵگە بکات.((

بە واتایەکی تر: ئەوە بیانوو نییە بۆ مرۆڤ کە بەویستی خۆی کار بە شتێک بکات تەنیا لەبەرئەوەی لەنێوان زانایاندا ڕاجیایی لەسەر هەیە.

کەواتە مامەڵەی دروست چۆنە بەرانبەر ئەم ڕاجیاییەی لەنێوان زانایاندا هەیە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە، کە لەنێو وتە و بۆچوونی زانایاندا بگەڕێین بەدوای پێکاوترین و نزیکترینیان لە ڕاستی بەپێی تەرازووی قورئان و سوننەت، نەک بەپێی تەرازووی دانانی تەنیا زانایەک لە زانایانی نێو موسڵمانان بە داوەر و یەکلاکەرەوە لە هەر ڕاجیاییەک کە پێشدێت.

بەڵگە چییە لەسەر ئەم قسەیە؟

بەڵگەکە ئەوەیە کە خودای گەورە و بێهاوتا دەفەرموویێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ [النساء: ٥٩]

واتە: «جا ئەگەر لە شتێکدا دووبەرەکیتان هەبوو ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خودا و پێغەمبەر (ﷺ)ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەو کارەتان باشترە و ئاکام و ئەنجامی چاکترە.»

---

(١) جامع بيان العلم وفضله (١١٥/٢ ط. ابن الجوزي).

گەڕانەوەش بۆ خودا -وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا -واتە بۆ قورئان، گەڕانەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)واتە: بۆ لای خۆی لە ژیانیدا و بۆ سوننەتەکەی لە دوای وەفاتی.

کەواتە هەڵوێستی دروست لەمەڕ ڕاجیایی زانایان بە تێڕامان لە بەڵگەی هەریەک لە بۆچوونەکان دەبێت و لە دروستی بەڵگەکە (صحة الدليل) و ڕووی بەبەڵگەهێنانەوەکە (وجه الإستدلال) لە ڕووی زمان و واتا شەرعییەکانەوە، پاشان حوکمدان بە پێکاوی ئەوەیان کە نزیکترینانە لە کۆکبوونی لەگەڵ واتا و مەغزای بەڵگەکانی قورئان و سوننەت.

هەموو ئەمانەش لە حاڵێکدا دەبێت کە ئەو کەسەی لە ڕاجیاییەکە دەکۆڵێتەوە خاوەنی کەرەستەگەلی زانستی پێویست بێت کە بەهۆیانەوە دەتوانێت هەڵسەنگاندن لەنێوان بۆچوونەکان و بەڵگەکانیان و ڕووی بەڵگەپێهێنانەوەیان بکات، خۆ ئەگەر کەسەکە بەو جۆرە نەبوو ئەوا بۆی هەیە چاو لە کەسێک بکات کە پێی وایە بە چاولێکردن و (تەقلیدی) ئەو لە ئەنجامەکەی پێشوو نزیک دەبێتەوە، کە گەیشتنە بە مەبەستی خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ، هەروەک خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ۝٤٣﴾ [النحل: ٤٣]

واتە: «دەی پرسیار بکەن لە زانایان و شارەزایان ئەگەر ئێوە نازانن.»

لێرەدا خوێنەر مافی خۆیەتی بپرسێت: ئەگەر هەموو لایەنەکانی ڕاجیایی لە زانایان لەسەر ئەم هەنگاوانە کۆکن و دانی پێدا دەنێن، کەواتە بۆچی ڕاجیا دەبن؟

پرسیارێکی بەجێیە، بۆ وەڵامەکەشی ڕوودەکەینە ئەم سەرباسە و ئەو ڕوونکردنەوانەی لەگەڵیدا دێن:

## هۆکارەکانی ڕاجیایی لەنێو زانایاندا:

### یەکەم: نەگەیشتنی دەقە شەرعییەکە بە زاناکە

ئاشکرایە کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ژمارەیان زۆرە، بۆ هەندێک لە هاوەڵان و کۆمەڵێک لە زانایانی دوای ئەوانیش ڕوویداوە کە لە هەندێک بابەتدا پێچەوانەی بەڵگە و دەلیلەکان فەتوایانداوە، بەهۆی ئەوەی هەر لە بنەڕەتدا بەڵگەکەیان پێ نەگەیشتووە، بۆیە لەوەدا بیانوویان هەیە، بەڵام ئەم بابەتە جیاوازە لەوەی کەسێک کە پێی گەیشتووە ڕاجیایی لە پرسەکەدا هەیە، ئەو کەسە هیچ بیانوویەکی نییە لەوەی قسەی ئەو زانایە وەربگرێت کە بەڵگەکەی پێ نەگەیشتووە لەکاتێکدا قسەی زانایەکی دیکەی بیستبێت کە بەڵگەی پێیە.

نموونە بۆ ئەمە: بەسەرهاتی عومەری کوڕی خەتتابە (خودا لێی ڕازی بێت.) کە لە باسی بەڵگەیەتی سوننەتیش ئاماژەمان پێدا، کاتێک نکووڵی کرد لە کاری ئەبو موسای ئەشعەری کە بەردەرگایماڵەکەی جێهێشتووە دوای ئەوەی سێ جار مۆڵەتی خواست و مۆڵەتی پێ نەدرا، لەڕاستیدا ئەبو موسا زانیارییەکی لە پێغەمبەرەوە پێبوو کە هەرکەسێک سێ جار مۆڵەتی خواست و مۆڵەتی پێنەدرا دەبێت بڕوات، ئەمەش لە عومەر شاراوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە کەس لاری نییە لەوەی عومەر لە ئەبو موسا زاناتر و فەقیهتر بووە.

چەشنی ئەمە بۆ زانایان و فەقیهان لە کۆن و نوێدا ڕوویداوە؛ کە بەڵگەیەکی ئاشکرا لە بابەتێکدا لای یەکێکیان شاراوە بێت و بۆچوونی پێچەوانە و موخالیفی ئەو بەڵگەیەی هەبێت چونکە ئەم بەڵگەکەی هەر نەبیستووە، لەوەشدا کە پێچەوانەی بەڵگەکە بووە بیانووی هەیە.

بەڵام، تۆ ئەی ئەو کەسەی ڕاجیاییەکەت پێگەیشتووە، کاتێک قسەی

لایەنەکەی دیکەت بیست و زانیت بەڵکەی لەگەڵدایە بیانوویەکت نییە کە قسە و بۆچوونی زانای یەکەم وەرگریت کە بەڵگەکەی پێ نەگەیشتووە.

## دووەم: جیاوازی لە تێگەیشتن بۆ بەڵگەکە

دوای جەنگی ئەحزاب پێغەمبەر (ﷺ) ویستی تیرەی بەنی قورەیزە تەمبێ بکات لەسەر ئەو ناپاکییەی کردیان، بۆیە بۆ هاندانی هاوەڵان تا گورج برۆن پێی فەرموون: «لا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ مِّنْكمُ العَصْرَ إِلا فِي بَنِی قُرَيْظَة»[١] واتە: «هیچ یەکێک لە ئێوە نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قورەیزە نەبێت.» هاوەڵان دەرچوون، لە ڕێگەدا بوون کە کاتی نوێژی عەسر هات، کۆمەڵێکیان گوتیان: نوێژ ناکەین مەگەر لە بەنی قورەیزە نەبێت وەک پێغەمبەر (ﷺ) پێمانی فەرموو، کۆمەڵێکی تریشیان گوتیان مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نەبوو کە لە بەنی قورەیزە نەبێت نوێژ نەکەین بەڵکوو مەبەستی ئەوە بوو کە پەلە بکەین، بۆیە ئەمان لەڕێگەدا نوێژەکەیان کرد، کاتێکیش گەیشتنەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) سەرکۆنەی هیچکام لەم دوو دەستەیەی نەکرد، لەبەرئەوەی ئەوانەی نوێژەکەیان کردبوو کاریان بە فەرمانە خوداییەکەی پێشوو کردووە کە نوێژکردنە لەکاتی خۆیدا، ئەوانەش کە دوایان خستبوو کاریان بە ڕواڵەتی فەرمانەکەی دواتر کردووە کە نوێژ نەکەن مەگەر لە بەنی قورەیزە.

کەواتە لە هۆکارەکانی ڕاجیایی زانایان: جیاوازییانە لە تێگەیشتنی بەڵگە شەرعییەکە.

---

(١) صحيح البخاري (٩٤٦).

## سێیەم: گومانی بوونی بەڵگەیەکی بەرهەڵستکار

ئەمەش بەوەی کە زاناکە فەرموودەکەی پێگەیشتبێت و واتا و ئاماژەی بەڵگەکەش ئاشکرا بێت، بەڵام وا گومان ببات بەڵگەیەکی دیکەی بەهێزتر هەیە کە بەرهەڵستی دەکات جا ئایەتێک بێت یاخود فەرموودەیەک، بۆیە وا دەبینێت کە ئەو فەرموودەیەی پێی گەیشتووە نەسخ بووەتەوە یان بۆ هەلومەرج و شێوەیەکی تایبەتە، یاخود بەڵگەکەی دیکە سەربخات (تەرجیحی بکات) بەسەریدا ئەگەر نەیتوانی کۆکردنەوە و تەبایی لەنێوان دوو بەڵگەکەدا بکات.

کەواتە مامەڵەمان لەگەڵ ڕاجیاییەک چۆن بێت کە بەم هۆکارە دروست دەبێت؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: بڕوانینە هەڵوێست و بۆچوونی ئەو زانایەی جیاوازە لەگەڵی و کۆکردنەوەی لەنێوان هەردوو بەڵگەکەدا کردووە، ئەگەر لەسەر بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا کۆی کردبوونەوە و توانیبووی ئەو تێکگیرانە لاببات کە وا گوماندەبرێت لەنێوانیاندا هەیە، ئەوکات لەسەر ئەم بنەمایە دەڕۆین: «بەکارخستنی دوو بەڵگە لەپێشترە لە فەرامۆشکردنی یەکێکیان» بەم پێیە ئەو بۆچوونەی کە دەبێتە هۆی کارکردن بە هەردوو بەڵگەکە بەتەبایی لەپێشترە لەوەی کە یەکێکیان بەرپەرچدەداتەوە.

## ئایا ڕاجیایی ڕەحمەتە؟

لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە کە دەفەرموێت: «اختلاف أمتي رحمة» واتە: «ڕاجیایی لە ئوممەتەکەمدا ڕەحمەتە.)) ئەم گێڕانەوەیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)لە ڕووی سەنەدەوە سەحیح نییە. فەرموودەناسانیش بە لاوازیان داناوە.»[1]

ئەمە لەڕووی سەنەد و ڕشتەوە، بەڵام ئایا ئەمە لە ڕووی واتاوە ڕاستە؟ ئایا ڕاجیایی ڕەحمەتە یان نا؟

ئەگەر لە جۆرەکانی ڕاجیایی وردبببینەوە کە لەنێوان زانایاندا ڕوویانداوە دەبینین هەندێکیان ڕەحمەت و فراوانی و ئاسانکارین، ئەمەش ئەو جۆرەیە کە دوو لایەکەی ڕاجیایی تێیدا بەڵگەگەلێکی نزیک لە هاوشانییان بەدەستەوەیە، هەر لایەکیش بە بەڵگەی قورئان یاخود سوننەتی سەحیح بەڵگە بۆ بۆچوونەکەی دەهێنێتەوە و تێگەیشتنەکەشی بۆ بەڵگەکە ڕێی تێدەچێت و شیاوی قەبووڵکردنە، هەروەها بەڵگەی هیچکامیان لەگەڵ بەڵگەیەکی تری بەرهەڵستکاری بەهێز و (ڕاجیح) تێکناگیرێت، دەمێنێتەوە کۆشش و ئیجتیهاد لە پێشخستن و پەسەندکرنی یەکێک لە بۆچوونەکان کە بەپێی کۆمەڵێک لە نیشاندار (قەرینە) وابەستەکانیان دەبێت، لێرەدا ڕاجیایی ڕەحمەتە و فراوانییەکی زۆری تێدایە و هیچ بەرتەسکی و تەنگاوکردنێکی لەسەر خەڵک تێدا نییە، کەم نین ژمارەی ئەو بابەتە فیقهییانەی وێنای ئەم جۆرە لە ڕاجیایی دەکەن لەنێوان زانایاندا، ئەمەش ڕێگر نییە لەوەی هەوڵی زانینی پێکاوترین بۆچوون بدەین لەناویاندا.

بەڵام ئەگەر لە حاڵەتی ڕاجیاییەکەدا بۆچوونێکی جیاواز هەبێت کە بە ئاشکرا پێچەوانەی دەقێکی شەرعی سەحیح و جێگیر بێت

---

(١) بڕوانە: كشف الخفا للعجلوني (٦٤/١) ط. إحياء التراث.

کە هیچ بەڵگەیەکی بەرهەڵستکاری سەحیحی دیکەی لەبەرانبەردا نەبێت، لەوکاتەدا هیچ ڕەواییەک نییە بۆ سەرپێچیکردنی دەقەکە، هیچ دەستکراوەییەکیش نییە بۆ کەسێک کە لە دەقەکە تێگەیشتبێ و فراوانی بواری خیلاف بکاتە بەڵگە و هۆکار بۆ ئەو کارە.

هەرکەس دەیەوێت زیاتر لەبارەی ڕاجیایی نێو زانایان ئاگاداربێت، با بگەڕێتەوە بۆ پەڕتووکەکەی شێخول ئیسلام (ئیبن تەیمییە) بە ناونیشانی (رفع الملام على أئمة الأعلام).

لێرەدا جێی خۆیەتی ئەوە بیر خوێنەر بهێنینەوە کە زۆرێک لە پرسە شەرعییەکان لەو جۆرەن کە تەبایی و هاوڕایی لەنێو زانایاندا لەسەرە و هیچ ڕاجیاییەکیان لەنێواندا نییە لەسەریان، هەروەک گرنگە جەخت لەسەر ئەو پرسە هاوکۆکی لەسەرانە بکرێنەوە؛ چونکە بە گشتی ئەوانە لەمەڕ ئەو کارانەن کە لە شەرعدا داوای ئەنجامدانیانمان لێ کراوە، ئێمەش ئوممەتی کار و ئوممەتی بەرهەمدارییین.

## ڕاستی (حەقیقەت) لای کێیە؟

زۆرجار دێتە پێش کە هەست بە پەستییەکی زۆر دەکەین لە بەرانبەر ئەو کەسانەی وادەزانن لە هەموو ئەو بابەتانەی قسەی لێوە دەکەن حەقیقەت و ڕاستی لای ئەوانە، چ لە پرسەکانی پەیوەست بە ئایینەوە یاخود لە بابەتە سادەکانی ژیانی ڕۆژانە، گەر لە حاڵی خەڵکیش تێبفکرین - مەبەستم ئەوانەیە کە خۆیان بە شوێنکەوتەی ئیسلام دادەنێن -لە هەڵوێستییان لەبارەی خاوەندارێتی حەقیقەت، دەبینین دابەشدەبن بەسەر سێ جۆردا:

- بەشێکیان پێی وایە ئەو هەمیشە لەسەر حەقە و لە هەموو پرسەکانیشدا و ئەوەی ناکۆک بێت لەگەڵی لەسەر پووچی و ناڕەوایی و هەڵەیە.

- بەشێکی دیکەیان پێی وایە کە ئەو لە هەندێک بابەتدا لەسەر حەقە و لایەنی بەرانبەر تێیاندا لەسەر هەڵەیە، بەڵام باوەڕیشی وایە کە زۆرێک لەو بابەتانەی ئەو وادەزانێت تێیاندا پێکاویەتی بابەتگەلی (ئیجتیهادی) و کۆششکارین -واتە: بەڵگەیەکیان لەسەر نییە کە ئاماژەی ئاشکرا بەدەستەوە بدات بەڵکوو کۆششیان تێدا دەکرێت و دەستکراوەییان تێدایە بۆ بۆچوونی جیاواز- و پێی وایە ڕێشی تێدەچێت بۆچوونی بەرانبەرەکەی پێکابێتی و تێڕوانینەکەی ئەویش شیاوی پێکانە.

- هەرچی جۆری سێیەمە هەڵگرانی بیردۆزەی «ڕێژەییبوونی حەقیقەت»ن، کە پێیان وایە بابەتەکە لە هەموو ڕاجیاییەکدا ڕێژەییە و هەمووان ئەندازەیەک لە ڕاستییان پێیە، لە ڕا و بۆچوونەکاندا شتێک نییە بە ناوی باتڵ و ناڕەوا، تەنانەت هەندێک لەوان ڕەنگە بگاتە ئاستێک کە پێی وابێت ئایینەکانی تری بێجگە لە ئیسلامیش دەمانگەیەنن بە خودای گەورە!

بۆ ئەوەی باسکردن لە ڕاجیایی بەم گشتگیرییە نەبێت و ڕاستییەکان

لەناو دەربڕینە گشتییە نارۆشنەکاندا ون نەبن، ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکان لەم پرسەدا بەپێی بوارەکانی خیلاف ڕەنگە ئەو هەڵەتێگەیشتنە بڕەوێنێتەوە کە هەندێک گیرۆدەی بوون.

## یەکەم: سەرەتا بە جیاوازی نێوان ئایینەکان دەست پێ دەکەین

ئەم بابەتە لە قورئان و سوننەتدا هێندە ڕوون و ئاشکرایە بە جۆرێک پێویستی بە هیچ نییە لە باوەڕهێنان و شوێنکەوتن زیاتر، ئەو بەڵگانەش کە لەسەری هەن نە کێشەدار و نە شاراوەن، قورئان و سوننەت زۆر بە ڕۆشنی و بەهێزی ئاماژە بەوە دەکەن کە هەموو ئاییەنەکان لەدوای هاتنی ئیسلام پووچ و بەتاڵن و خودای گەورە پێغەمبەرەکەی بە ڕێنوێنی و هیدایەت و ئاییبنی ڕاست ڕەوانەکردووە تا سەری بخات بەسەر هەموو ئایین و بەرنامەکانی تردا، هەر کەسێکیش بێجگە لە ئیسلام پەیڕەوی هەر ئایینێکی دیکە بکات لێی وەرناگیرێت و لە قیامەتیشدا لە مایەپووچ و زیانمەندانە، هەروەها ئاماژە بەوە دەکەن کە بیرۆکەی سێ خودایی لای گاورەکان و بەدرۆزانینی پێغەمبەرمان لای ئەوان و لای جوولەکەش کوفر و بێباوەڕییەکی ئاشکرایە بە خودای گەورە، هەرچی ئەو دەقانەشە کە باس لە پاداشتی گشتی دەکەن و کەسانێک بۆچوونی خۆیانی پێدا هەڵدەواسن، ئەوانە بەشێکن لە دەقگەلی کورتبێژ (موجمەل) و فرەڕاڤە (موتەشابیە) کە دەگێڕدرێنەوە بۆ لای دەقە دامەزراو و ڕوونەکان، ئەگەرنا هەرگیز ناگونجێت تێگەیشتنی ئەوان بۆ ئەو دەقانە لەگەڵ کۆی دەقە ئاشکراکانی دیکە کۆببێتەوە کە فەرمان دەکەن بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) و هۆشیاری دەدەن لە نافەرمانی و سەرپێچیکردنی.

هەروەها خۆ ئێمە لە سوورەتی فاتیحەی هەموو نوێژێکدا ئەمە دەڵێینەوە: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ [الفاتحة: ٦-٧]

واتە: «خودایە ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگا ڕاستەکەی خۆت، کە ڕێگای ئەو کەسانەیە لە ناز و نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە، نە ڕێگای گومڕا و سەرگەردانەکان.»

مەبەست لەوانەی خەشم و قینیان لێ گیراوە جوولەکەیە، ئەوانەش کە سەرگەردان و گومڕان مەبەست پێ نەسرانییەکانە .

ئەبو حاتەمی ڕازی دەڵێت: "نەمبیستووە لەنێوان ڕاڤەکارانی قورئاندا ڕاجیاییەک لەسەر ئەمە هەبێت."[١]

خۆ ئەگەر هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بەو ئاییینانەی نەسخ بوونەتەوە و دەستکاری کراون بەم جۆرە بێت، ئەوا شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا و نکووڵیکردن لە بوونی خودا لەپێشترن بۆ ئەم بەناڕەوا دانانە.

(١)تفسير ابن كثير (١/١٤٤ ط. طيبة).

## دووەم: جیاوازی لەنێوان تاقمەکانی ئوممەتی ئیسلام لە پرسەکانی بیروباوەڕدا

پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ئەو پرسانەی بۆ خەڵکی ڕوونکردووەتەوە کە لە لایەنی بیروباوەڕەوە پێویستە باوەڕیان پێی بێت، وەک چۆن ئەو کارانەی بۆ ڕوونکردوونەتەوە کە پێویستە ئەنجامیان بدەن یاخود لێیان دووربکەونەوە و خودای گەورە بابەتەکانی بیروباوەڕی نەداوەتە دەست ڕا و بۆچوونەکان، چونکە ڕا و بۆچوونەکانی مرۆڤ هەرگیز لەسەر شتێک کۆک نابن لە پرسەکانی عەقیدەدا، مەگەر نابینین حەز و پەسەندکاری هەندێک لە خەڵکی پەلکێشی کردوون بۆ پەرستنی مشک و مانگا و بەرد و خۆر و مانگ، یان بۆچوونگەلێکی دیکە وایان لە خاوەنەکانیان کردووە باوەڕیان وابێت دوورخستنەوەی زیان و خراپە بەندە بە پەتێکەوە کە مرۆڤ لە مەچەکی دەئاڵێنێت.

لەکاتێکدا دەبینین ئیسلام لە پرسەکانی بیروباوەڕدا بە ڕوونبێژییەکی ئاشکرا و ڕۆشناییەکی خوداییەوە هاتووە کە هیچ گومانێک هەڵناگرێت، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ)ئەوەی بۆ موسڵمانان ڕوونکردووەتەوە کە لەسەریان پێویستکراوە لە باوەڕبوون بە خودا و ناو و سیفەتە بەرزەکانی و قەزا و قەدەر و فریشتەکان و ڕۆژی دوایی، جەختیشی کردووەتەوە لە گرنگی شوێنپێهەڵگرتن و خراپی داهێنان لە پرسەکانی ئاییندا بە هەردوو لایەنی بیروباوەڕ و کردارییەوە و فەرموویەتی: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهْوَ رَدٌّ»[١] واتە: «هەرکەس لەم دینەی ئێمەدا شتێک دابهێنێت کە تێیدا نەبێت لێی وەرناگیرێت و ڕەتدەکرێتەوە.»

لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی: «وَكلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ»[٢] واتە: «هەموو

---

(١)صحيح البخاري (٢٦٩٧)، و صحيح مسلم (١٧١٨).

(٢) صحيح مسلم (٨٦٧)

داهێنراوێکیش گومڕاییە.»

گومانیشی تێدا نییە کە ڕێگۆڕین و پشتهەڵکردن لە باوەڕهێنان و تەسلیمبوون بەوەی لە دەقەکانی هەردوو وەحییەکەدا هەیە و بەرپەرچدانەوەیان بە ڕا و بۆچوونەکان لە گەورەترین داهێنراوەکانە لە دیندا، لەڕاستیدا پێغەمبەر (ﷺ)ئێجگار زۆر سوور بوو لەسەر گەیاندنی سوود بە ئوممەتەکەی و دوورخستنەوەی زیان لێیان، تا ئەوپەڕی گرنگیشی بە ڕوونکردنەوەی دینەکە دەدا، هەموو ئەو دەقانەشی گەیاند کە پەیوەندییان بە بیروباوەڕەوە هەیە وێڕای زۆرییان، بێ ئەوەی ڕێنمایی ئوممەتەکەی بکات کە مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵدا بکەن جیاواز لەو مامەڵەیەی لەگەڵ دەقەکانی یاسا و حوکمەکانی شەرع دەیکەن، خۆ ئەگەر ڕێگایەکی دیاریکراوی تایبەت هەبووایە کە ویستبای مامەڵەی پێ لەگەڵ دەقەکانی عەقیدە بکەین بەدڵنیاییەوە ڕێنوێنی دەکردین بۆی، بەتایبەتی لەبەرئەوەی ڕاجوێکان لە بابەتەکانی عەقیدەدا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕواڵەتی ئەو دەقانە لە وەسفی خودای بێهاوتادا ناپەسەندن، بەڵکوو هەندێکیان بە ئاشکرا دەڵێن ڕواڵەتی ئەو دەقانە کوفرن! بەڵام ئەگەر بابەتەکە بەو جۆرە بووایە بێگومان ڕوونکردنەوە و ڕێنوێنیمان لەسەریان لەو کەسەوە پێدەگەیشت کە لە هەمووان بەغیرەتتر و دڵێرتر بووە لەبارەی پەروەردگاری و لەسەر باوەڕ و عەقیدەی موسڵمانان کە موحەممەدە (ﷺ).

هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ڕاستییانەیان بە خۆبەدەستەوەدان و باوەڕێکی تەواوە لە پێغەمبەرەوە وەرگرت، هەرگیز بە بەراوردکاری نابەجێ یاخود بە بۆچوونگەلی ڕووت و بێبەڵگە بەرهەڵستییان نەکرد، گەر بزانین حاڵی ئەوان چۆن بووە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)لەو بابەتانەی دینداری کە تێیاندا ڕووبەڕووی گرفت و ئاڵۆزی دەبوونەوە، ئەوکات ڕاستی ئەو قسەیەی سەرەوەمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە

ئەوان بەردەوام پرسیارییان لێ دەکرد و داوای ڕوونکردنەوەیان لێ دەکرد لە بوارە جیاجیاکانی ئایینەکەدا، هەموو ئەمانە لەبارەی هاوەڵانەوە بە تۆمارکراوی لە دانراوەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و پەڕتووکەکانی ئەسەر و شوێنەواری هاوەڵاندا هەن، کەچی نابینین ئەوان هیچ کات گرفتێکیات لەگەڵ دەقەکانی عەقیدەدا هەبووبێت کە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بیستبوویان، ئەو چەند بابەتەش کە لە پرسی قەدەردا زانراوە لەنێو هەندێک لە هاوەڵاندا ڕاجیاییان تێدا ڕوویداوە لەدوای ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ)بە قبووڵکردن و تەسلیمبوونەوە قەبووڵکراون، لەکاتێکدا نابینین چەشنی ئەم مشتومڕە لەنێوانیاندا لەسەر دەقەکانی پەیوەست بە سیفاتی خودای گەورەوە ڕوویدابێت کە ڕاجیایی ئوممەت لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا تا ئەمڕۆ درێژەی کێشاوە دوای چواردە سەدە لە کۆچی دوایی پێغەمبەری هەڵبژاردە (ﷺ).

لە ناوەڕاست و کۆتاییەکانی سەردەمی هاوەڵاندا گۆڕانکاری لەم ڕوونی و خاوێنییە عەقیدەییەدا -لەناو خەڵک- دەستی پێ کرد لە چەند ڕوویەکەوە؛ وەک باوەڕ و بێباوەڕی (ئیمان و کوفر)، تکاکاری(شەفاعەت)، قەدەر، ڕۆچوون لە بەگەورەدانانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب) خودا لێی ڕازی بێت(.، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕاجیاییەک لەنێوان هاوەڵاندا نابینین لە هەڵوێستیان لەمەڕ ئەم گۆڕانکارییانە و تاکە هاوەڵێکیش نییە چووبێتە پاڵ یەکێک لەم بۆچوونە لادەرانە و پشتگیری کردبێتن، بەڵکوو هەمیشە هەڵوێستێکی بەهێزیان هەبووە لە نکووڵیکردن و بەرپەرچدانەوەیاندا.

نموونەی ئەوە: هەواڵ درا بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خودا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت.) کە کەسانێک لە شاری بەسرە لە فێرخوازانی زانستی شەرعی و قورئان خوێنان نکووڵی لە قەدەر دەکەن، ئەویش فەرمووی: (فَإِذَا لَقِيتَ أُولَئِك فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي بَرِيءٌ مِنْهُمْ، وَأَنَّهُمْ بَرَاءُ مِنّي، وَالَّذي يَحْلِفُ

بِهِ عَبْدُ اللّٰهِ بنُ عُمَرَ لَوْ أَنَّ لأَحَدِهِمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، فَأَنْفَقَهُ مَا قَبِلَ اللّٰهُ مِنْهُ حَتّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ)[١] واتە: "ئەگەر بەوانە گەیشتیت پێیان ڕابگەیەنە کە من بەریم لەوان و ئەوانیش بەرین لە من، سوێند بەو زاتەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر سوێندی پێ دەخوات ئەگەر یەکێک لەوان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕی هەبێت و بیبەخشێ، خودا لێی وەرناگرێت هەتاوەکوو باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت".

پاش ئەوانیش شوێنکەوتووان (تابیعین) ئەو زانستانەی لە هاوەڵانەوە وەریانگرتبوو پاراستییان، هەریەک لە تەفسیری قورئان و فیقهی شەریعەت و دادوەری و قەزاوەت و فەرموودەیان لەوانەوە وەک خۆی گواستەوە، وتەکانیان لە پەڕتووک و دانراوە گەورەکانی وەک (مصنف عبد الرزاق و ابن أبي شيبة) و چەشنی ئەواندا نووسرانەوە، لە هەموو ئەو سەرچاوانەشدا لە هیچ یەکێک لەوانمان نەبینی هەڵوێستێکی تریان لەو دەقانە هەبێت جیاواز لەو هەڵوێستەی لەکاتی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) هەیانبووە.

دواتر لەگەڵ دوورکەوتنەوەی سەردەم و مردنی هاوەڵان و فراوانبوونی بازنەی فتوحاتی وڵات و ناوچەکان و تێکەڵاوبوون لەنێوان فەرهەنگ و ئایینەکان، هەندێک لە موسوڵمانان کاریگەربوون بە کەرەستەگەلێکی زانستیی وەرگیراو لە فەرهەنگ و کلتورەکانی دیکە کە لەسەریانی پێویست دەکرد هەڵوێستێک لەمەڕ دەق و پرسەکانی عەقیدە وەرگرن تەواو جیاواز بێت لە مەنهەجی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، دەرەنجام لەنێو خەڵکدا ڕێچکە و تاقمگەلێک پەیدا بوون کە ئامادەییەکی وایان هەبوو تەنانەت لە پادشا و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عەباسیش تێیاندا بوو پاڵپشتی بڕێک لەو ڕێچکانەی دەکرد و بە هێزیش هەوڵی سەرخستنی دەدا، دژایەتی ئەو زانایانەشی دەکرد کە پابەندی مەنهەجی یەکەم و پێشین بوون، وەک

---

(١)صحيح مسلم (٨).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) کە بەسەرهاتی ئەو لە گرفتاری و تاقیکردنەوە و بەندکردن و لێدان بەهۆی مانەوەی لەسەر ئەو مەنهەجە لای زۆرینەمان زانراوە.

پێکانی حەقیش لەم ڕاجیاییانەدا لای هەمووان نییە، بەڵکوو لای ئەوانەیە کە لەسەر مەنهەجی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڕۆن کە ئەوانیش لە پێغەمبەری هەڵبژێردراوی خوداوە (ﷺ)بۆیان مابووەوە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە پەیوەندی و وابەستەیی لەنێو موسڵماناندا بپچڕێنرێت لەلایەنی مامەڵە و پشتیوانی و هاوکاری یەکتری، بەتایبەت لەکاتێکدا کە موسڵمانان لە ڕەهەندێکی زۆر لەوە گەورەترەوە و لە بنەڕەتەکانی دینەکەیاندا بەئامانج دەگیرێن.

بۆیە لەم ڕاجیاییەدا ئەوەی پێویستە بکرێت، ڕوونکردنەوەی حەق و ڕاستییە بە بەڵگەکانی و ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆ موسڵمانان و ڕێنماییکردنیان بۆ ئەو حەقەی پێشین و نەوەکانی سەرەتای ئەم ئوممەتە لەسەری بوون و ڕوونکردنەوەی هەڵەیی ئەو جیاوازی و ناکۆکییەی دوای ئەوان سەریهەڵدا.

## سێیەم: ڕەهەندی ڕاجیایی لەنێوان زانایان لە بابەتە فیقهییەکاندا

ئەم بابەتەش لە بەشێکی سەربەخۆی ئەم پەڕتووکەدا باسمانکرد، بۆیە بە سوپاسەوە لە خوێنەری بەڕێز دەخوازم سەردانی بکاتەوە، لەژێر ناونیشانی »بۆچی زانایان ڕاجیا دەبن؟«

# بەشی چوارەم

## ئەو پرسانەی مشتومڕیان لەسەر دەگوزەرێت

- حیکمەت لە بوونی شەڕ و نەهامەتی
- بانگەشەی ستەملێکراوی ئافرەت لە ئیسلامدا
- ئازادی
- ئایین و عەقڵ
- گومان خستنەسەر ئیسلام بەهۆی بەجێماوی موسڵمانان

## حیکمەت لە بوونی شەڕ و نەهامەتی

لەڕاستیدا مامەڵەی هەڵەی توێژێک لە لاوان لەگەڵ پرسیاری ”بۆچی شەڕ و نەهامەتییەکان هەن و بەڵا و مەینەتی ڕوودەدەن لەکاتێکدا خودا خاوەن میهر و بەزەییە؟“ ئەوانی تا گومانکردن لە بوونی خودای گەورە و بێهاوتا بردووە، بگرە تیایاندایە قۆناغی گومان و سەرلێشێواوی تێپەڕاندووە بەرەو نکووڵی و بێباوەڕی ئاشکرا، زۆرجاریش هۆکاری ونبوونی ڕاستییەکان لای ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە بۆ تێروانینی کورتبینانە و بەدحاڵیبوون و پێشداوەری بەر لە تێفکرین، سەرباری ئەوەش، ئەوان کاتێک ڕوویان لە بێئایینی کرد و وازیان لە ئیسلام هێنا مەگەر هیچ تەفسیرێکی دروستیان بۆ بابەتی شەڕ و نەهامەتی دۆزییەوە؟

نەخێر، بەبێ گومان، هەرگیز ڕاڤە و لێکدانەوەیەکی ژیرانە و دروستیان بۆ ئەم بابەتە لە بازنەی ئیلحاد و بێئایینیدا نەدۆزییەوە و نایدۆزنەوە، چونکە ئەوان باوەڕیان وایە ئەوکەسەی بە ستەملێکراوی و بێچارەیی دەمرێت ،کۆتاییەکەی ژێرخاکە و هەرگیز مافی خۆی وەرناگرێتەوە، بە هەمان شێوە ئەوەش کە بە ستەمکاری و زۆرداری دەمرێت کۆتاییەکەی هەر ژێرخاکە و هەرگیز سزای سەرکەشییەکەی وەرناگرێت، ئەمەش دووفاقییەکە لە تەرازووی دادگەریدا هەرگیز جێی قەبووڵکردن نییە.

وروژێنەرانی ئەم پرسیارە وا گومان دەبەن کە دژیەکی لەنێوان بوونی بەڵا و موسیبەتەکان و سیفەتی میهر و ڕەحمەتی خودادا هەیە، لەکاتێکدا ڕوودانی بەڵا و تاقیکردنەوەکان تەواو یەکانگیرە لەگەڵ ئەو هەواڵانەی خودای گەورە داوێتی نەک پێچەوانە بێت، چونکە خودای گەورە لە زۆر

جێگەی پەڕتووکەکەیدا هەواڵی پێ داوین کە ئەو بەندەکانی تاقیدەکاتەوە بە چەندان جۆری بەڵا و تاقیکردنەوە، لەوانە ترس و برسێتی و کەموکورتی لە ماڵ و سامان و لە خودی کەسەکان و بەروبومەکانیش، هەر خودای گەورە لەپەڕتووکەکەیدا باسی حیکمەت و داناییەکەشی دەکات، بۆیە مامەڵکردن لەگەڵ ئەم پرسیارە بەشێوەیەک وەک ئەوەی خودای گەورە هیچ هەواڵێکی لەبارەیەوە پێ نەدابین هیچ نییە جگە لە لە کەمووکوورتی لە بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەدا.

کەواتە لەپێناو تێڕوانینێکی دروست بۆ پرسی بوونی شەڕ و نەهامەتی و کۆگیری لەنێوان ئەم پرسە و بوونی بەدیهێنەرێکی حەکیم و کارزاندا با لەم حەقیقەت و ڕاستییانەی ئیسلام ڕابمێنین:

### ڕاستی یەکەم:

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ﴾ [العنكبوت: ٦٤]

واتە: «بێگومان ژیانی ئەم دونیایە جگە لە سەرگەرمی و گاڵتەوگەپ شتێکی تر نییە و بەڕاستی ماڵی قیامەت هەر ئەوێ ژیانە.»

ناگونجێت هیچ کەسێک لە حیکمەتی بوونی نەهامەتی و شەڕ تێبگات پێش ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی ئەم دونیایە ماڵێکی کاتییە، جێی هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوە و کەموکورتییە، ئەو کەسەی چاوەڕێی بینینی کەماڵ و تێر و تەواوی ڕەها بکات تێیدا، ئەوە پێچەوانەی حیکمەتە خوداییەکە جوڵاوەتەوە کە دەیەوێت ماڵی دوارۆژ جێی کەماڵ و تێر و تەواوی بێت، و هەر ئەوێ ژیانی ڕاستەقینە و بەردەوام و جێی هەرمان بێت، بۆیە ئیسلام جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەم دونیایە لە تێڕوانینی خودای گەورەدا هیچ نییە.

خۆ ئەگەر دەگوترێت: ئەم قسانە بۆ کەسانی ئیماندار سوودی هەیە،

بەڵام کاتێک لەگەڵ کەسانی بێئایین و مولحیددا قسەدەکەین چۆن دەتوانین بەمانە قایلیان بکەین؟

وەڵامەکەی ئەوەیە، کە هەر لە بنەڕەتدا ناشێت لە پرسی حیکمەتی بوونی شەڕ و خراپە تێبگەین بەبێ باوەڕهێنان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی، بۆیە ئەگەر ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەین کەسێکی مولحید و بێباوەڕ بوو پێویستە لەگەڵیدا بگەڕێینەوە بۆ چوارگۆشەی پێشوو کە چوارگۆشەی سەلماندنی بوونی خودایە (ﷺ)، پاشان سەلماندنی ڕاستێتی پەیامەکەی، هەموو ئەمانەش دەشێت بە بەڵگەگەلی عەقڵی بکرێن و بەڵگە بۆهێنانەوەیان تەنیا لەسەر دەقێک نەوەستاوە کە ئیمانێکی پێشوەخت بخوازێت؛ هەرکات ئەم دوو پرسە سەلمان «بوونی خودا و ڕاستی پەیامەکە»، بێگومان ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەش سەلماوە، ئەمەش ئەو چوارگۆشەیەیە کە ئێستا قسەی تێدا دەکەین.

خودای گەورە لەبارەی ڕۆژی زیندووبوونەوەوە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ [غافر: ١٧]

واتە: «ئەمڕۆ هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەی پاداشت وەردەگرێت، ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمکردنێک نییە.»

لە ڕۆژی قیامەتدا خودای باڵادەست بە حەق دادوەری لەنێوان بەندەکانی دەکات، ماف بۆ ستەملێکراو دەستێنێت و سزای زاڵم و ستەمکار دەدات لەپای ستەمەکەی، ئەمەش تەنیا لەسەر ئاستی مرۆڤەکان نییە، بەڵکوو ئاژەڵانیش دەگرێتەوە، چونکە لە فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ)هاتووە کە فەرموویەتی: «لَتُؤَدُّنَّ الحُقوق إلَى أهلها يَوْمَ القيامة حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الجَلْحَاءِ مِن الشَّاةِ القَرناء»[١] واتە: «سوێند بە خودا مافەکان

---

(١)صحيح مسلم (٢٥٨٢).

دەدەنەوە بە خاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا، تەنانەت تۆڵەی مەڕ و بزنی بێشاخ لە مەڕ و بزنی شاخدار دەکرێتەوە.»

بەواتای ئەو مەڕەی کە لە دونیادا شاخی نەبووە و لەلایەن بزنێکی شاخدارەوە قۆچی لێ دراوە لە ڕۆژی دواییدا مافی خۆی وەردەگرێتەوە، تەنانەت ماڵات و ئاژەڵانیش! ئەی ئەبێ حاڵی نەوەی ئادەم چۆن بێت؟!

ئەو کەسەش کە لە دونیادا بە هەژاری و مەینەتی ژیاوە بەڵام دەرهەق بە پەروەردگاری باشی هێناوە، بە نقومکردنێک لە بەهەشتدا هەرچی ئەو نەداری و نەهامەتییانەی بیردەچێتەوە کە بەسەریدا هاتووە.

بۆیە کەسێک کە تێڕوانینی بۆ ئەو نارەحەتییانەی تووشی مرۆڤ دەبن تەنیا لە گۆشەنیگایەکی دونیاییدا کورتهەڵهاتبێت، بێگومان لەم بابەتەدا ستەم و نادادی دەبینێت، بەڵام ئێمە باوەڕی تەواومان بەوە هەیە کە ئەم دونیایە هیچ نییە جگە لە ڕاڕەوێک بەرەو جێیەکی تر کە ماڵی ئاخیرەتە.

کەواتە پێویستە لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەدا لە پرسی بوونی شەڕ و نەهامەتی تێبگەین، کە دونیا نە جێی وەرگرتنەوەی پاداشتی تەواوەتییە و نە جێی سەندنەوەی تەواوی مافەکان، بەڵکوو تەنیا جێی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە.

### ڕاستی دووەم:

خودای گەورە ویست و ئیرادەیەکی بە مرۆڤ داوە کە بەهۆیەوە لەنێوان باش و خراپ (خێر و شەڕ)دا هەڵبژێرێت، ئەمەش لەپێناو ئەو ئەرکپێدان و تەکلیفەی لەسەریان دادەنێت، چونکە کەسی بێویست و ناچار ناکرێت تەکلیفی لەسەر دابنرێت، تەنیا کەسی سەرپشک و هەڵبژێر تەکلیف و داوای ئەنجامدانی کاری لێ دەکرێت.

کاتێکیش مرۆڤ شەڕ و خراپە هەڵدەبژێرێت (وەک کوشتار و ستەم و دزیکردن و داوێنپیسی و چەوساندنەوە و خواردنی مافی خەڵک و هاوشێوەی ئەوانە)، ئەوا کارەکە دەدرێتەوە پاڵ کەسەکە خۆی نەک خودای گەورە و زۆرینەی ئەو شەڕ و خراپانەش کە لە دونیادا هەن تەنیا بەهۆی مرۆڤەوەن و دەستکردی ئەون، بۆ نموونە پاشەڕۆ پیشەسازییەکان کە دەبنە هۆی چەندان نەخۆشی، یان ئەو جەنگانەی ملیۆنان کەسیان تێدا دەکوژرێت هەموویان دەستکردی مرۆڤن.

خودای گەورە مافی گشت ستەملێکراوان بەتەواوی لە ستەمکاران دەستێنێتەوە، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا کە خۆی ویستی وابووە ئەوێ بکاتە جێی وەفا بە بەڵێن و سەندنەوەی مافەکان.

لێرەدا ڕەنگە پەڵپێک لەم ڕاستییە بێتە پێش، بەڵام خودای گەورە -بە قەدەری خۆی- ئەندازەگیری هەموو شتێکی کردووە و زانیویەتی، لە وەڵامی ئەمەشدا دەڵێین: هەر لە قەدەری ئەوە کە بژاردە و سەرپشکییەکی ڕاستەقینەی بە مرۆڤ داوە؛ ئیتر چۆن دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی مرۆڤ نادرێتەوە پاڵ خۆی؟

لەوانەشە پەڵپێکی دیکە لەسەر ئەم ڕاستییە بهێننەوە ئەویش بە هەندێک لەو پێشهات و کارەساتانەی کە ڕاستەوخۆ لە کاری مرۆڤ نین وەک گڕکانەکان و هاوشێوەکانیان، وەڵامی ئەمەش بەو حەقیقەتانەی دیکە دەدرێتەوە کە لێرە باسمکردوون، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کارەساتانەی لە گەردووندا دەگوزەرێن چەند جۆرێکن، هەندێکیان سزای خوداییـن لەپای خراپەکاری خەڵکی، هەندێکی تریان بەشێکن لە ڕێڕەوی ئەو یاسایانەی کە ڕەوتی گەردوون و هاوسەنگیی ژینگە و هاوشێوەی ئەمانە دەیخوازن، هەندێکی دیکەشیان بۆ ڕاچڵەکاندنی مرۆڤن تا مەزنی بەدیهێنەرەکەی بخەنەوە یاد لەبەرانبەر سنووردارییی توانا مرۆییەکانی ئەم و لاوازی

ASTANA

له‌هه‌مبه‌ر ویست و قه‌ده‌ره‌كانی خودای باڵاده‌ست، زۆرێكی دیكه‌ش له‌ حیكمه‌ت و مه‌به‌ستگه‌لێك كه‌ ته‌نیا خودای گه‌وره‌ خۆی ده‌یانزانێت.

## ڕاستی سێیه‌م:

له‌ڕاستیدا زۆرێك له‌و شه‌ڕ و به‌ڵایانه‌ی ده‌یانبینین له‌ هه‌موو ڕوویه‌كه‌وه‌ شه‌ڕ و خراپه‌ نین، به‌ڵكوو لایه‌نی باش و خێریشیان تێدایه‌، چه‌ندان پێشهات هه‌ن كه‌ ئێمه‌ به‌ خراپیان ده‌زانین و له‌ هه‌ناویاندا خێر و فه‌ڕێكی گه‌وره‌یان هه‌ڵگرتووه‌، هه‌ندێكجار مرۆڤ دووچاری نه‌خۆشییه‌ك ده‌بێت كه‌ ده‌بێته‌ هۆی لادانی به‌ڵایه‌كی زۆر له‌وه‌ گه‌وره‌تر لێی، یاخود مرۆڤ له‌ گرێبه‌ستێكی داراییدا شكست دێنێت كه‌ ئه‌گه‌ر قازانجی تێدا كردبایه‌ بوغرا و له‌خۆبایی ده‌بوو، یان ڕه‌نگه‌ كه‌سه‌كه‌ منداڵێكی بمرێت كه‌ به‌ ژیان و مانه‌وه‌ی ده‌بووه‌ ده‌رده‌سه‌ری بۆی، له‌وانه‌شه‌ مرۆڤه‌كه‌ به‌ كار و كرده‌وه‌كانی خۆی شیاوی ئاگری دۆزه‌خ بێت -كه‌ كاره‌ساتی ڕاسته‌قینه‌ ئه‌وه‌یه‌- به‌ڵام خودای گه‌وره‌ تووشی به‌ڵا و موسیبه‌تێكی ده‌كات و ئه‌م ئارامی له‌سه‌ر ده‌گرێت و په‌روه‌ردگاریش به‌ به‌هه‌شت پاداشتی ئارامگرییه‌كه‌ی ده‌داته‌وه‌ -كه‌ ئه‌وه‌ خێر و خۆشی ڕاسته‌قینه‌ و نه‌بڕاوه‌یه‌-، بۆیه‌ خودای گه‌وره‌ شه‌ڕ و خراپه‌یه‌ك بۆ مرۆڤه‌كان ناخوڵقێنێت كه‌له‌هه‌موو ڕوو و لایه‌نێكه‌وه‌شه‌ڕبێت، شه‌ڕ و خراپه‌ش هه‌رگیز نادرێته‌ پاڵ ئه‌و وه‌ك له‌ فه‌رمووده‌ی سه‌حیحدا هه‌یه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌یفه‌رموو: «والشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ»[1] واته‌: «شه‌ڕ و خراپه‌ش نادرێته‌ پاڵت.»

## ڕاستی چواره‌م:

خودای باڵاده‌ست شتانێك ده‌بینێت ئێمه‌ نایانبینین، زانا و ئاگاداره‌ به‌ شتانێك كه‌ ئێمه‌ لێیان بێئاگاین، شتانێكیش دێنێته‌ بوون كه‌ ئێمه‌

---

(١)صحيح مسلم (٧٧١).

نایانزانین، خودای گەورە هەمان زاتی حەکیم و کاربەجێیە کە جێدەستی حیکمەتی لەسەر هەموو شتێک لە دروستکراوەکانیدا دەرکەوتووە، هەر ئەو زاتە ڕەحیم و میهرەبانەیە کە خواردنی پێداین لەو دەمەی ئێمە لە سکی دایکماندا بووین و هەموو شتەکانی دەوروبەرمانی بۆ ڕامکردووین، بۆیە ئێمە کە بە تەسلیمبوونی تەواوەوە باوەڕمان بەم بنەمایە هەیە، ئەگەر شتێکمان بینی کە حیکمەت و مەبەستەکەیمان نەزانی ئەوکات عەقڵ و ژیری وا پێویست دەکەن کە بەراورد و (قیاس) بکەین وەک چۆن لە هەر بابەتێکی تردا دەیکەین، چونکە ئێمە کاتێک دەبینین کۆمپانیایەکی بەرهەمهێن لە بەرهەمەکانیدا ئەوپەڕی کارامەیی و وردبینی بەخەرجدەدات و بەرهەمەکانیشی تاقیدەکەینەوە و ناوازەیی و بەدڵکاری و پتەوییانمان بۆ دەردەکەوێت، دوای ئەوە ئەگەر لە هەندێک لە بەرهەمەکانیدا شتێکیش ببینین کە لە سوود و گرنگییەکەی تێنەگەین، هەر بنەماکەی پێشووی ئاستی بەرهەمەکانی ئەوان و وردکاریانمان لەبەرچاوە، بۆیە بەدوای سوودێکی شاراوە و مەبەستێکدا دەگەڕێین کە لە پشت دروستکردنییەوە خۆی حەشاردابێت، ئیتر بۆچی هەندێک کەس هەڵپەیانە بۆ نکووڵیکردن کاتێک بابەتەکە لەبارەی خودای گەورەوەیە کە بەدیهێنەری کارزان و کارجوانی گشت بوونەوەرە؟

## ڕاستی پێنجەم:

لە ڕێساکانی خودای گەورە بۆ ژیانی دونیا بریتییە لە ململانێی بەردەوامی نێوان (حەق و باتڵ)، هەر بۆیەش ئیبلیسی خوڵقاند کە سەردەستەی شەڕ و خراپەیە، هیچ دەسەڵاتێکیشی پێ نەدا بەسەر مرۆڤەکاندا جگە لە سەرلێشێواندن و ڕازاندنەوەی نافەرمانی و بێباوەڕی لەلایان، لەگەڵ ئەوەشدا خودای گەورە ئێمەی بەبێ ڕوونکردنەوەی ئەو مەترسییانە جێنەهێشتووە کە لە شەیتان و تاقمەکەی و گومڕاکارییانەوە

دێنە ڕێمان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ﴾ [فاطر: ٦]

واتە: «بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن.»

لە جێیەکی تردا دەفەرموێت: ﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ﴾ [النور: ٢١]

واتە: «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بەدوای هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن، هەرکەس شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێت- دووچاری کاری ناپەسەند دەبێت- چونکە بەڕاستی شەیتان هەمیشە فەرمان بە کاری ناپەسەند و قێزەون دەکات.»

کەواتە هەرکەسێک شوێنی بکەوێت لە دەستە و تاقمی ئەوە کە دەستەی باتڵ و مایەپووچانن ﴿ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٩﴾ [المجادلة: ١٩]

واتە: «شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە بەجۆرێک یادی خودای لەبیر بردوونەتەوە، ئەوانە کۆمەڵ و تاقمی شەیتانن، هۆشیاربن کە هەر تاقمی شەیتان لە دونیا و دوارۆژدا زیانمەندن.»

هەرکەسێکیش بەرهەڵستی بکات و تەمای بە ڕەحمەت و میهری خودا و ڕەزامەندی ئەو بێت، ئەوە لە سەرفراز و ڕەزامەند و ڕازیکراوان دەبێت.

هەندێک کەس خۆیان لەم مانا و مەبەستە خودابیە بێئاگان، پاشان دێن لەبارەی هەندێک وردەباسەکانی ناوییەوە دەپرسن بە زمانی پرسیارکەرێکی پەڵپگریش، بۆ نموونە لەبارەی هۆکاری خوڵقاندنی ئیبلیسەوە دەپرسن، یان هۆکاری بوونی زۆردار و ستەمکاران و پرسیارگەلی تری لەو چەشنە.

## ڕاستی شەشەم:

بوونی خودای گەورە بە بەڵگەگەلێکی زۆر و هەمەجۆر و پێویستکەر و براوە سەلماوە کە هیچ یەک لە گومانەکان لە بەرانبەریاندا خۆ ناگرن و لە بالای بەڵگەبوونیشیاندا ناگەنە ئاستیان، بەرمەبنای ئەمە؛ چاوداخستن لەم بەڵگانە لەپێناو وردەگومانێکی دیاریکراو -وەک گومان لەبارەی بوونی شەڕ و نەهامەتی- لەڕاستیدا هیچ نییە جگە لە سەرخستنی لایەکی زۆر لاواز بەسەر لایەکی زۆر بەهێزدا و پێشخستنی لق بەسەر بنەڕەتدا، خۆگێلکردنیشە لەو کەلێن و لارییانەی لە گومانەکەدا هەن بەرانبەر ئەو ڕێکی و تەواوییەی لە ڕاستییە بنەڕەتییەکەدا هەیە.

## بانگەشەی ستەملێکراوی ئافرەت لە ئیسلامدا

چەند پارچە ڤیدیۆیەکم بینیوە بە شێوەیەکی درامی سەرنجڕاکێش و کاریگەر ئامادەکرابوون و وێنای مێینەیان وەک ستەملێکراو و مافخوراوێک نیشاندەدا لە سایەی ئیسلامدا، دڵنیام چەشنی ئەم پەیامانە -کە لەپشت ئەم کارە هونەرییانەوەن- سەرکەتوو بوون لە کەمەندکێشکردنی بڕێک لە کچان و ئافرەتانی ئیمان لاواز بەرەو تاریکاییەکانی گومان و لەوێشەوە بۆ ئیلحاد و نائایینی، زۆرجار گومانسازان لە دەروازەی پرسی ئافرەتەوە دێنە ناوەوە و گومان دەخەنە سەر ئیسلام؛ لەم ڕێیەوە هەوڵی وروژاندنی هەست و سۆزی ئەو ئافرەتە موسڵمانانە دەدەن کە بەدروستی لە دینەکەیان تێنەگەیشتوون و نەیانناسیوە، لەڕاستیشدا ئەم گوتارە گومانڕێژییەیان لە ناپاکی و ساختەکارییەک زیاتر نییە، ئەم حەقیقەتەشمان کاتێک بۆ ڕووندەبێتەوە کە بزانین ئەو لایەنانە چین، ئەوان گوێی خۆیانی لێ دەئاخنن لەکاتی باسکردنی پرسی ئافرەت لە ئیسلامدا.

لێرەدا بە چەند خاڵێک ئاماژە بەو لایەنانە دەکەم:

**یەکەم**: پشتگوێخستنی ڕەهەندەکانی ڕێزلێنراوی و پایەداری ئافرەت لە ئیسلامدا

مەگەر تا ئێستا لە هیچکام لەوانتان بیستووە باسی ئەوە بکات کە خودای گەورە نموونەی باوەڕدارانی بە دوو ئافرەت هێناوەتەوە تا پیاوان و ئافرەتان چاویان لێ بکەن و پێشەنگییان لێوە وەرگرن؟

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ

إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١١ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ [التحريم: ١١-١٢]

واتە: «خودا نموونە بە ژنەکەی فیرعەون -ئاسیەی کچی موزاحیم - دێنێتەوە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، کاتێک گوتی: پەروەردگارا! لەلای خۆت لە بەهەشتدا خانوویەکم بۆ دروست بکە و لەدەستی فیرعەون و کردەوەکانی ڕزگارم بکە و لەدەست ئەم هۆزە ستەمکارەش ڕزگارم بکە، هەروەها نموونە دێنێتەوە بە مەریەمی کچی عیمران کە داوێنی خۆی بەپاکی ڕاگرت.»

چۆن ڕێی تێدەچێت دینێک کە ئافرەت دەکات بە پێشەنگ بۆ پیاوانی، بەکەم سەیری ئافرەت بکات؟

یاخود لە هیچ یەک لەو گومانسازانەتان بیست باسی ئەو پێگەیە بکات کە دایک لە ئیسلامدا پێی بەخشراوە، پلەوپایەیەک کە بە هەموو سیستم و ڕێبازەکانی دیکەی دونیا نەیانتوانیوە پێی ببەخشن! بپرسە لە هەر موسڵمانێک کە دینەکەی بەچاکی ناسیبێت، کێ لەدوای پێغەمبەری خودا (ﷺ)گەورەترین مافی بەسەرتەوە هەیە؟ پێت دەڵێ: دایکم! ئەگەر لێیشی بپرسی: ئەمەت لە کوێوە هێنا؟ دەڵێ: لە ئیسلامەوە.

ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی لە ئەبو هورەیرەوە (خودا لێی ڕازی بێت) کە: «جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: (أُمُّک(، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (أُمُّک)، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (أُمُّک)، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (أَبُوک).»[1] واتە: «پیاوێک هاتە لای پێغەمبەری خودا (ﷺ)و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا کێ شیاوترینی خەڵکییە بەوەی بە چاکی هاوەڵێتی بکەم؟ فەرمووی: دایکت، پیاوەکە

---

(١)صحيح البخاري (٥٩٧١).

گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت، پیاوەکە دیسان گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت، پیاوەکە گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: باوکت.»

خۆ ئەگەر بەو لۆژیکە ساویلکەیە ڕۆشتباین کە کاڵفامەکان کاری پێ دەکەن، دەبوو بڵێین: ئیسلام فەزڵی ئافرەتی داوە بەسەر پیاودا! چونکە لەم فەرموودەیەدا دایک خراوەتە پێش باوکەوە! یان تا ئێستا هیچکام لەو گومانسازانە هەڵوەستەیەکیان کردووە لەسەر باسی فەزڵ و گەورەیی چاکەکردن دەرهەق بە مێینە لە ئیسلامدا؟

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خودا لێی ڕازی بێت.) گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرموویەتی: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا -وَهُوَ وَضَمَّ أَصَابِعَهُ-»[١]، واتە: «هەرکەسێک سەرپەرشتی و پەروەردەی دوو کچ بکات تاوەکوو پێدەگەن، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا من و ئەو بەم شێوەیە پێکەوەین، -لەوکاتەدا پەنجەکانی جووت کردن-.»

ئەم فەرموودەیە لە کاتێکدا گوترا کە عەرەب لەدایکبوونی مێینەیان بە خراپ و نەنگی لەقەڵەمدەدا، بۆیە یان بەسەرشۆڕییەوە دەیانهێشتەوە یاخود زیندەبەچاڵیان دەکرد و لەتوێی خاکیان دەنا! پاشان مەگەر موسڵمان هیچ داوا و خواستێکی هەیە باڵاتر بێت لەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بێت؟ دەی بڕوانە چۆن چاکەکردن دەرهەق بە مێینە کراوە بە ڕێگایەک بۆ گەیشتن بەم پلەیە! لەکاتێکدا هیچ فەرموودەیەک نەهاتووە تایبەتکرابێت بە فەزڵ و پێگەی پەروەردەکردنی نێرینە -هێندەی من ئاگادار بم-.

---

(١)صحيح مسلم (٢٦٣١).

**دووەم:** گوێ کەڕکردن لە باسی ئەو بارسووکی و ئاسانکارییەی لەسەر ئافرەت هەیە لە ژمارەیەک حوکمی شەرعیدا بەرانبەر ئەو سەختگیرییەی لەسەر پیاوان هەیە

لە نموونەی ئەو ئاسانکارییانە: بۆ ئافرەت دروستە زێڕ بپۆشێت بەڵام لەسەر پیاوان حەرامە. یاخود ڕێگە بە ئافرەت دراوە کە ئاوریشم بپۆشێت و لەسەر پیاوان حەرامکراوە. هەروەها لەسەر پیاو واجبە ماڵ و سەروەت بەخەرجبدات بۆ هاوسەری و بەردەوام خەرجی بکێشێت ئەگەرچی هاوسەرەکەی دەوڵەمەندیش بێت، بەڵام لەسەر ئافرەت پێویست نییە خەرجی هاوسەرەکەی بکێشێت!

لەسەر پیاو واجبە ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بێت لە مزگەوتدا -بەپێی بۆچوونی پەسەند لای زانایانی فیقە- بەڵام لەسەر ئافرەت واجب نییە. جیهاد و تێکۆشان لەسەر پیاوان واجبکراوە چ بە واجبی کیفائی، یان واجبی عەینی -بەپێی دۆخەکە- بەڵام لەسەر ئافرەتان واجبنەکراوە، لەگەڵ ئەوەی لە جیهاددا مرۆڤ ڕەنگە سەریشی تێدابچێت. هەروەها -لە شەریعەتی ئیسلامدا- سەرانە لە پیاوانی ناموسڵمان وەردەگیردرێت بەڵام لە ئافرەتان وەرناگیرێت!

ئیبن قەییم (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە پەڕتووکی (أحكام أهل الذمة) دا دەفەرمووێت: ”سەرانە لەسەر منداڵ و ئافرەت و شێت نییە، ئەمە مەزهەبی هەر چوار پێشەواکەی فیقهـ و شوێنکەوتووانیشیانە.“ ئیبن مونزیر دەفەرمووێت: ”نەمزانییوە زانایانی بێجگە لەوانیش ڕاجیاییان هەبووبێت لەم حوکمەدا.“ هەروەها ئیبن قودامەی مەقدیسی لە موغنیدا دەفەرمووێت: ”نەزانراوە لەنێوان زانایاندا ڕاجیاییەک لەسەر ئەمە هەبێت.“[1]

---

(١)أحكام أهل الذمة، لإبن القيم (١٤٩/١)، / المغني، لأبي محمد بن قدامة (٣٣٨/٩)، / الإجماع، لإبن المنذر (ص ٦٢).

**سێیەم:** خۆ وێڵکردن لەو شوێنەوارە نەرێنییە زۆرانەی دەرەنجامی ترازان لە ڕێساکانی شەریعەتی خودا بۆ ئافرەت پەیدا دەبن

بە چ تاوانێک ساڵانە بە نەشتەرگەرییەکانی لەباربردن ملیۆنان کۆرپەلە لەناودەبرێن کە لە پەیوەندییە ناشەرعییەکانەوە دروستبوون؟

لەکاتێکدا کە زۆرینەی ئەم کۆرپەلانە گیانیان بەبەردا کراوە، ئیتر بە چ تاوانێک دەکوژرێن؟

مەگەر ئەم کۆرپەلەیە مافی ژیانی نییە؟ یان ئازادی تێرکردنی ئارەزوو لەپێشترە؟

دەی ئەگەر چارەنووسی ئەم ڕۆحە پاک و بێگوناهانە هەر کوژران و لەناوبردن بێت، کەوایە بۆچی هەر لە بنەڕەتەوە کارئاسانی بۆ ئەو پەیوەندییانە دەکرێت کە دەبنە هۆی دروستبوونیان؟

بەڕاستی ئازادییەکی ساختە و درۆیینەیە!

نموونەیەکی دیکە، ڕێگری کردن لەو باوکەی دەیەوێت ئازادی کچەکەی سنووردار بکات کاتێک کچەکەی بە ڕێگەیەکی هەڵەدا دەڕوات و بەرەو لادان دەچێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم باوکە ڕەنگە نزیکەی بیست ساڵ ماندوێتی کێشابێت لە پەروەردە و پێگەیاندنیدا، بە سەروەت و ماڵ و هەوڵی بێوچان و کاتی حەوانەوەی خۆی قوربانی دابێت لەپێناویدا، بەڵام کاتێک کیژەکەی دەگاتە تافی لاوێتی، گریمان -بە نموونە- بڕیاریدا پەیوەندی ناشەرعی ببەستێت، لەوکاتەدا بەناوی مافی ئافرەتەوە دەبنە بەربەست لەبەردەم باوکەکەدا تا جڵەوگیری کچەکەی نەکات لە کارێک کە دوور نییە ئابڕووی کچەکەی لەکەدار بکات بەهۆی نغرۆبوونی لە گێژاوێکدا کە نازانێت بەرەو چ تاریکاییەکی دەبات!

لێرەدا ئەوان ڕێگری باوکەکە لە خراپ بەکارهێنانی ئازادی لەلایەن کچەکەیەوە بە ستەم و زۆرداری لەقەڵەمدەدەن، کەچی هیچ ناهەقی و شورەییەک نابینن لە بەربەستدانە بەر ڕێی باوکەکە تا نەتوانێت کچەکەی لەم کارە هەڵانە دووربخاتەوە!

نموونەیەکی دیکە، ئەو داڕووخان و سەرەولێژبوونەوەیەی -دەرەنجامی دەرچوون لە یاسی خودایی- لە فیترەتی مرۆڤدا ڕوودەدات و وای لێ دەکات لادانی جنسی بە هاوڕەگەزخوازی و ئارەزوویەکی سروشتی ناوبنات!

هەروەها کاتێک لادەران لە یاسای خودا کارئاسانییان بۆ ڕێگەکانی بەستنی پەیوەندی ناشەرعی کرد دەرگاکانی ناپاکی هاوسەرگیری خرانە سەر پشت، لەوێوە ڕیشە و بنەچەکان تێکەڵبوون! کەم نین ئەو منداڵانەی کە لە پەیوەندی ناشەرعییەوە دروستبوون و باری گرانی بەخێوکردن و پەروەردە و خەرجیکێشانیشیان هەر لەسەر شانی ئافرەتەکە بەتەنیا ماوەتەوە؟

هەربۆیە دەبینی ئەو ئافرەتانە ناچاردەبن لە هەر بوارێکدا کاربکەن تەنیا بۆ بەدەستهێنانی بژێوییان، بۆ نموونە وەزارەتی کاری ئەمریکا لە ماڵپەڕی فەرمی خۆیاندا[1] ئامارێکیان بڵاوکردووەتەوە کە نیشانی دەدات ڕێژەی ٨٩٪ی ئەو کرێکارانەی لە ماڵاندا وەک خزمەتکار و پاککەرەوە کاردەکەن لە ئافرەتانن!

**چوارەم**: ئەوان حیکمەتەکانی خودای گەورە لەبەرچاوناگرن لە حوکم و یاساکانی تایبەت بە ئافرەت

وەک هەڵوێستییان لە پرسی میرات و وتەی خودای گەورە ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ [النساء: ١١]

---

(1) http://www.dol.gov/wb/factsheets/20lead2007.htm.

واتە: «بەشەمیراتی نێرینە ئەندازەی بەشی دوو مێینەیە.»

کە وا گومان دەبەن ئیسلام ستەمی لە ئسافرەت کردووە بە پێدانی نیوەی میراتی نێرینە، ئەم گومانەش لە چەندین ڕووەوە بەرپەرچدەدرێتەوە، بۆ نموونە:

زانینی ئەوەی کە میرات چەند حاڵەتێکی هەیە، تێیاندایە ئافرەت زیاتر لە بەشی پیاوی پێدەدرێت، تێشیاندایە هاوتای پیاوی پێدەدرێت، لە هەندێک باریشدا مێینە میرات دەبات و پیاو هەر نایبات، لە هەندێکیشیاندا بەشی ئەو کەمتر لە بەشی پیاو دەبێت، بەڵام گومانگسازان ئەمانە نازانن یان دەزانن و خۆیان لە نەزانی دەدەن!

زۆرجار دەبیستین کە بە لاقرتێوە ئەمە دووبارە دەکەنەوە ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾ [النساء: ١١]

واتە: «بۆ هەریەک لە دایک و باوکی مردووەکەش شەش یەک هەیە.»

کە تێیدا یەکسانی لەنێوان پیاو (باوک) و ئافرەت (دایک) دەکرێت، هیچ کاتێکیش نەمانبیست باسی ئەو یەکسانییە بکەن -لەنێوان بەشەمیراتی پیاو و ئافرەتدا- کە لە ئایەتەکەی دواتردا هاتووە، خودای گەورە لەوێدا دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ﴾ [النساء: ١٢]

واتە: «خۆ ئەگەر پیاوێک یان ئافرەتێک مرد و نە باوانی هەبوو نە منداڵ، تەنیا برایەک یان خوشکێکی لە دایکەوە هەبوو بۆ هەر یەکێک لەوانە شەش یەکی میراتەکە هەیە، بەڵام ئەگەر برا و خوشکە دایکییەکان لە یەکێک زیاتر بوون ئەوکاتە هەموویان هاوبەشن لە سێیەکی میراتەکەدا بەیەکسانی.»

مانای وایە: لێرەدا پیاو و ئافرەت هاوبەشن بەبێ هیچ زیادە پێدانێک بە یەکێکیان.

هەروەها نێرینە ئەگەر لە هەندێک باریشدا ئەندازەی دوو بەشی مێینە ببات، بەڵام ئەو لە شەرعدا فەرمانی پێ کراوە کە لەکاتی هاوسەرگیریدا مارەیی بە مێینە بدات، هەروەک فەرمانیشی پێ کراوە بەدرێژایی ژیانی و تا هاوسەری بێت خەرجی بکێشێت ئەگەرچی ئافرەتەکە دارا و دەوڵەمەندیش بێت، ئیتر دوای ئەمەش پێی ڕەوا نابینرێت بەشەمیراتی ئەو دووهێندەی بەشەمیراتی ئافرەتەکە بێت؟

**پێنجەم**: چاویان لەو دژیەکییانە دادەخەن کە لەنێوان بیرۆکەکانی ئەوان و واقیعدا هەیە

بۆ نموونە ئەوان دژایەتی هاوسەرگیری شەرعییان دەکرد لەگەڵ ئەو کچانەی کە ئەوان بە بچووک ناویاندەبردن، بەڵام دەبینین ئامارەکان باس لە ڕێژەیەکی گەورەی دووگیانی ناشەرعی دەکەن لەنێو ئەم تەمەنەدا!

هەروەها ئەوان زۆر بەتوندی دژی فرەژنی دەوەستنەوە وێڕای ئەوەی چەندژنی هیچ زۆرلێکردنێکی تێدا نییە، بەڵکوو ئەوە هەر خودی ئافرەتە بڕیاردەدات کە ببێتە هاوسەری دووەم یاخود سێیەم، بەڵام هەر ئەو پیاو و ئافرەتانە خۆیان فرەدۆستی ناشەرعی پەیڕەودەکەن لەژیانیاندا!

ئەوان بانگەشەی ئازادی ئافرەت دەکەن لە پەیوەندییەکانیدا کەچی ئەو ئازادی و مافەی لێ زەوت دەکەن کاتێک دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی هاوسەرداردا بکات!

**شەشەم**: ئەوان دیدگای خۆیان بە گونجاوتر و بەسوودتر دادەنێن بۆ ئافرەت لە یاسا و بەرنامەی بەدیهێنەری بێهاوتای

لەبەر ئەوەشە یەکسانی دەکەن لەگەڵ پیاو بە یەکسانییەکی ڕەها و لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەمەش پێچەوانەی سروشتی پێکهاتەی هەریەک لەوانەیە، هەڵبەت لە بەرنامەی خودای گەورەدا بنەما لە حوکم و ڕێساکاندا بریتییە لە یەکسانی نێوان پیاو و ئافرەت، بەڵام ئەمە یەکسانییەکی ڕەها نییە لە هەموو شتێکدا، بەڵکوو هەندێک حوکم هەن تایبەتن بە پیاوان، هەروەک حوکمگەلێکیش هەن تایبەتن بە ئافرەتان، {وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ} [آل عمران: ٣٦] واتە: «نێرینەش وەک مێینە نییە.»

**حەوتەم**: ئەو داب و نەریتە هەڵانەی ستەمیان دەرهەق بە مێینە تێدایە دەدەنە پاڵ ئیسلام

بۆ نموونە: کاتێک سەرپەرشتیاری ئافرەتێک ناچاری دەکات بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسێک کە ئافرەتەکە نەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، ئەوان ئۆباڵی ئەم کارە دەخەنە ملی ئیسلام، چونکە ئەوەی بەو کارە هەستاوە کەسێکی موسڵمانە. ڕاستییەکەشی ئەوەیە، کە ئەم نەریتە لەو کارانەیە کە ئیسلام ڕێگری لێ دەکات، وەک لە فەرموودەی سەحیحدا چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: «لاتُنْكحُ الأَيِّمُ حَتّى تُسْتَأمَرَ، وَلاتُنْكحُ الْبِكرُ حَتّى تُسْتَأْذنَ، قَالُوا: يَارَسُولَ اللّهِ، وَكيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكتَ»[١]. واتە: «ئافرەتی بێوەژن مارەی نابڕدرێت تا خۆی بڕیار نەدات، کچیش مارەی نابڕدرێت تا مۆڵەت و ڕای وەرنەگیردرێت گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، مۆڵەتی چۆن لێ وەردەگیرێت؟ فەرمووی: بێدەنگبوونی نیشانەی ڕازیبوونیەتی.»[٢]

---

(١)صحيح البخاري (٥١٣٦)، صحيح مسلم (١٤١٩).

(٢) چیرۆکی ئەو ئافرەتەی باوکی بەزۆر بەشوویدا

ئەمانە حەوت کەلێن و کۆڵەواریی بەردەوامن لە گوتاری ئەو گومانسازانەی لە ڕێی پرسی ئافرەتەوە گومان دەخەنە سەر ئیسلام، تەنیا ئەمانەش بەسن بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر ئەو بەخراپ کەڵک وەرگرتن و بژارکارییەی تانەدەران لە ئیسلام لەسەر بنەمای هەوا و ئارەزوویان ئەنجامی دەدەن.

## ئازادی

بێگومان لە شیرینترین ئەو وشانەی بەر گوێی مرۆڤ دەکەون وشەی «ئازادی»یە، هەست دەکەیت پیتەکانی بۆنی ژیان، فراوانی، گەشانەوە و سەرەتایەکی نوێیان لێ دێت. مرۆڤ چەندە ڕقی لەوە دەبێتەوە لەلایەن مرۆڤێکی چەشنی خۆیەوە کۆت و بەند بکرێت کە هەر وەک ئەم دەخوات و دەخواتەوە و دەست بە ئاو دەگەیەنێت، مەگەر چ شتێک لە خەڵکی جیای دەکاتەوە تا دەست بەسەر ئازادییەکانییاندا بگرێت، تەنیا لەبەر پلەیەک یاخود سەروەتێک کە پێی دراوە؟ چ جیاوازییەک لەنێوان ئێمە و ئەودا هەیە تا بە ویستی خۆی یەکێک بێدەنگ بکات و یەکێکی دیکە بەند بکات؟

خۆزاڵکردنی مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا چیرۆکێکی لەمێژینەیە و بەدرێژایی سەدە و سەردەمەکان و لە وڵاتە جۆربەجۆرەکان دووبارەبووەتەوە، کاتێکیش خودای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ئەم کۆمەڵگا مرۆییانە نارد، پەیامی ئەوان باشترین ئامراز بوو بۆ ڕزگاربوون لە زاڵخوازی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەکاندا بەرەو ملکەچی هەمووان بۆ ئەو خودایەی لە ناو و سیفەتە بەرزەکانی بریتییە لە: (الواحد والأحد، الفرد الصمد، الذی لم یلد ولم یولد) واتە: تاک و تەنیای بێهاوتا، بێهاوبەش و جێی نیاز و بێنیاز، هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە.

بەڵکوو پەیامی پێغەمبەران واتاگەلێکی دیکەی ئازادی باڵاتر لەم ڕزگارییەشی لەخۆگرتووە، ئەویش بە ڕزگارکردنی مرۆڤ لە هەر بەندایەتییەکی شاراوە کە خۆی هەستی پێ ناکات، وەک ملکەچکردنی بۆ ماڵ و سامان و پەرستنی، یاخود بۆ حەز و ئارەزووەکانی.

وەک لە پێغەمبەرمانەوە (ﷺ) بە سەحیحی گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: «تَعِسَ عَبْدُ الدينارِ، تَعِسَ عَبْدُ الدِّرْهَمِ، تَعِسَ عَبْدُ الخميصة، تَعِسَ عَبدُ الخميلةِ، تَعِسَ وانتكس وإذا شيك فلا انتقشَ»[١]

واتە: «داوەشێ و لەناوچێ بەندەی دینار و درهەم -مرۆڤی پارەپەرست و پوولەکی کە خەمی تەنیا کۆکردنەوەی پارەیە-، داوەشێ بەندەی جل وپۆشاکی خەتداری گرانبەها، داوەشێ بەندەی ڕاخەر و بالیفی نەرم -مرۆڤی دڵبەستوو بەپەڕۆپاڵی دونیا-، داوەشێ و بەسەر لووتیدا بکەوێت، ئەگەر دڕکێک بەپێیدا چوو، بە مووکێشیش بۆی دەرنەیەتەوە.»

بۆیە بانگەشەکان بۆ ئازادی کاتێک ئەم واتایە نادیدە دەگرن، ئەوە لەڕاستیدا بانگگەلێک نین بۆ ئازادییەکی باڵای ئابڕوومەندانە، بەڵکوو بۆ ئازادییەکی ڕووکەش کە لە هەناویدا بەندایەتی و کۆیلایەتییەکی مەترسیدار هەیە بۆ کەس و شتانێک کە شیاوی بەندایەتی نین.

لەڕاستیدا قسەکردن لەبارەی ئازادی و ئەو مشتومڕەی لەسەر بابەتەکە هەیە پێویست بە شیکردنەوە و وردکردنەوەی هەلومەرجەکانی دەکات بەر لە بڕیاردان بە حوکمگەلێکی گشتی ڕەها کە ڕاستییەکان لەگەڵیدا وندەبن، چونکە لە ئێستادا دەستەواژەی ئازادی هەڵگری چەندین ڕەهەندی هزری و مێژوویی خاوەن سەنگ و قورساییە و چیتر ئەو دەربڕینە سادە و سەربەستە نییە.

لە دیارترین ئەو هەڵانەش کە زیان لە تێگەیشتنی مرۆڤ دەدەن بەکارهێنانی ئەو زاراوانەیە کە هەڵگری سەنگی مێژوویی و وابەستەی ڕاجیاییە فیکرییەکانن، بەبێ ڕوونکردنەوەیەک کە سنوورەکانی دەربخات و واتا دروستەکانی دەستنیشان بکات.

---

(١)صحيح البخاري (٢٨٨٧).

خەڵکی لەبارەی چەمکی ئازادییەوە دابەشبوون بەسەر گرۆ و ڕێبازگەلێکی جیاوازدا، تیایاندایە لایەنی نکوڵی و گومانکردن زاڵە بەسەر تێڕوانینیدا بۆ چەمکەکە، بۆیە دەبینیت ئەم جۆرەیان خۆی لەبەکارهێنانی وشەکەش بەدوور دەگرێت؛ بگرە لەوانەیە نکووڵی هەندێک لە واتا دروستەکانیشی بکات و بەرهەڵستییان بکات، تەنانەت ڕەنگە لە برێک لە گوتارەکانیدا -بە ناوی ئیسلامەوە- بناغەکاریش بۆ هەندێک لە واتاکانی کۆیلایەتی و ژێردەستەیی بکات بۆ مرۆڤگەلێک لە دەسەڵاتدار و خاوەن هەژموونەکان بەشێوەیەک کە خودای گەورە پێی ڕازی نییە، ئەمانە خۆیان مەترسین لەسەر ئیسلام.

کۆمەڵێکی تریش هەن خۆیان ئازاد و سەربەست نین لە بەکارهێنانی چەمکی ئازادی، بەڵکوو دیل و وابەستەی چەند نموونەیەکی مێژوویی و تەفسیرێکی دیاریکراون بۆ ئازادی و هیچ ڕاجیایی و ناکۆکییەکیش قەبووڵ ناکەن لەسەری، لەکاتێکدا ئەگەر سەیری حەقیقەتی ئەم جۆرەیان بکەیت، دەبینیت بانگەواز بۆ جۆرێک لە ئازادی دەکەن کە مرۆڤ بەرەو خراپە و گەندەڵکاری دەبات و ڕێز و شکۆی لێ دادەڕنێت و هەموو ئەو شتانەی لێ دادەماڵێت کە لە ئاژەڵ جیای دەکاتەوە، هەر لە سایەی ئەم نموونانەی ئازادیدایە کە داکۆکی لە لادانی جنسی و داوێنپیسی لەتەک ئاژەڵان و چەندین بەدکاری دیکە دەکرێت، هەروەک ڕەهەندی خۆپەرستی تێیاندا بەشێوەیەکی بێزراو زاڵە؛ ئەوەتا دەیبینین لەنێو ئەم نموونانەدا هیچ مافێک بۆ ئەو ملیۆنان کۆرپەلەیە نییە کە گیان و مافی ژیانیان لێ دەستێنرێت لەپێناو ئازادی هەڵگری کۆرپەلە لە تێرکردنی ئارەزووەکانی بە هەر شێوەیەک حەزبکات.

هەڵوێستی دروست و دادگەرانەش لەمەڕ پرسی ئازادی بە ناوەندگیری دەبێت لەنێوان هەڵوێستی ئەو دوو دەستەیەی باسکران، بە کۆکردنەوە

لەنێوان لەخۆگرتنی چەمکی ئازادی -بە واتا دروستەکەی- و سەرخستنی و بانگەواز بۆ کردنی و بەرگری لێ کردنی، لەگەڵ پاپەندبوون بە سنوورەکانی خودای گەورە کە لە پەڕتووکەکەیدا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەشی دایناون، ئەوکات گوزارشتی دروست بۆ سنوورەکانی ئازادی دەبێت بە: «ئازادی من لەو جێیە کۆتایی دێت، کە سنوورەکانی خودا دەستپێدەکات.»

لە لایەکی دیکەوە پێویستە لەباسی پانتایی ئازادی لە ئیسلامدا جیاوازی بکرێت لەنێوان ئازادی بیروباوەڕێک کە کەسەکە لە خۆیدا هەیەتی لەگەڵ ئەوەی کە لەنێو خەڵکدا ڕای دەگەیەنێت، چونکە ئیسلام بوونی بێباوەڕان لە خاکی خۆیدا قەبووڵ دەکات، وێڕای مانەوەشیان لەسەر بێباوەڕییەکەیان بە چەند مەرجێک، لەوانە: ڕانەگەیاندنی تانەدان لە ئایین و جاڕنەدانی ئاشکرای بێباوەڕی.

کاتێک جیاوازی لەنێوان ئەم دوو پلەیەدا ناکرێت، سەرلێتێکچوون لەم پرسەدا ڕوودەدات؛ بۆیە دەبینیت کەسانێک پێکەوەژیانی بێباوەڕان لەگەڵ موسڵمانان لە مێژووی ئیسلامیدا دەکەن بە بەڵگە لەسەر دروستی دانانی یاساگەلێک کە بێباوەڕان لەگەڵ موسڵماناندا یەکسان دەکات لە ڕووی بانگەواز کردنیانەوە بۆ ئایینەکەیان و دەرەنجامیش بە گومانکردنی خەڵک لە ئیسلام، ئەمەش هەڵەیە، چونکە بێباوەڕی ئەوان لەنێو خۆیان و لە ژینگەی داخراوی خۆیان شتێکە و ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەوەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی -و ئیسلام نکوڵی لێ دەکات- شتێکی دیکەیە.

نموونەیەکی تری لەم چەشنە، تێکەڵکردن لەنێوان ئەو ئازادییەی ئیسلام ڕێگەی پێ داوە بۆ پرسیارکردن لەمەڕ هەر بابەتێکی دین کە لای مرۆڤ ئاڵۆزی تێدا دروستدەبێت، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئەم پرسیار و -ئاڵۆزییە تاکەکەسییانە- لەنێو خەڵکدا و شێواندنی خاوێنی بیروباوەڕ و دڵنیاییان.

وێنەی یەکەمیان لە ئیسلامدا ڕووبەرێکی زۆری ئازادی پێدراوە ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ﴾ [البقرة: ٢٦٠]

واتە: «بەیاد بهێنە کاتێک کە ئیبراهیم گوتی: ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە، خودا فەرمووی: مەگەر تۆ هێشتا بڕوات نەهێناوە؟ ئیبراهیم گوتی: بەڵێ باوەڕم هەیە، بەڵام ئەمەوێت بیبینم بۆ ئەوەی بەتەواوی دڵنیابم.»

﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكّٖ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكَۚ﴾ [یونس: ٩٤] واتە: «جا ئەگەر تۆ لە گوماندای لەوەی بۆمان دابەزاندووویت ئەوا پرسیار لەوانە بکە کە پێش تۆ پەڕتووکی ئاسمانی شارەزابوون و دەیخوێننەوە.»

بۆیە پێویستە هیچ کاتێک دەرگای پرسیار و مشتومڕ و گفتوگۆ بە ڕووی ئەوانەدا دانەخرێت کە پرسیاریان لا دروستبووە یاخود گومان و دڕدۆنگییەکیان هەیە، بەڵام گەر ئەم گومان و دڕدۆنگییە بچێتە سەر شێوەی ڕاگەیاندن و برەوپێدان و بەگومانکردنی خەڵک، ئەوکات ئەمە لەو خراپە و مونکەرانەیە کە بەپێی شەرع پێویستە ڕێگری لێ بکرێت.[1]

بەهۆی کاریگەری کلتوورگەلی نائیسلامیشەوە هەندێک وا گومان دەبەن کە ئازادی لە ئیسلامدا واتە: وازهێنان لە بێباوەڕی و بیرە پووچ و بەتاڵەکان تا بەبێ ڕێگری و بەرهەڵستی بڵاوببنەوە، ئەمانە ئەو هەموو هەڵوێستانەیان لەبیر چووەتەوە کە خودای گەورە لە قورئاندا باسی دەکات و بەرپەرچی ئەم بۆچوونەیان دەداتەوە، لە نموونەی ئەو هەڵوێستانەش:

ئیبراهیم (سەلامی خودای لێ بێت) بتەکانی شکاند بەبێ ئامادەبووونی گەلەکەی و بەبێ ئەوەی ڕاوێژیشیان پێ بکات.

---

(١) سابغات (ط.٣، ص ١٦٧) بەدەستکارییەوە.

موسا (سەلامی خودای لێ بێت.) کاتێک گەڕایەوە لای گەلەکەی و بینی گوێرەکەیەکیان دەپەرست کە لە زێڕ و خشڵەکانیان دروستیانکردبوو، دەستبەجێ هەڵیگرت و سوتاندی و فڕێی دایە ناو دەریا، هاوکات بە سامری خاوەن بیرۆکە و دروستکەری بتەکەی گوت: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ٩٧﴾ [طه: ٩٧]

واتە: «سەیری خوداکەشت بکە کە بەردەوام دەتپەرست و بەلایەوە کەوتبوویت، دڵنیابە دەیسوتێنین و خۆڵەمێشەکەشی بە دەریادا پەرژ و بڵاو دەکەینەوە.»

پێغەمبەر موحەممەدیش (ﷺ) کاتێک چووە ناو مەککە ئەو ڕۆژەی ڕزگاری کرد سێسەد و شەست بت لە دەوروبەری کەعبە هەبوون، هەرگیز چاوەڕێی مۆڵەتی لە قورەیش نەکرد بۆ شکاندنیان، بتەکانی شکاند بەدەم وتنەوەی ئایەتی: ﴿وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ٨١﴾ [الإسراء: ٨١] واتە: «بڵێ، تازە حەق و ڕاستی هاتووە و باتڵ و ناحەقی ڕۆیشت و پووچەڵ بوویەوە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەر تیاچووە.»[١]

---

(١) صحيح البخاري (٤٧٢٠).

# ئایین و عەقڵ

چەشنی ئەو ڕاجیایی و دابەشبوونەی لە پرسی ئازادیدا هەبوو، بە هەمان شێوە لە هەڵوێستیش لەبارەی عەقڵەوە خەڵکی دابەش بوون بەسەر دید و تێڕوانینی جیاوازدا.

دەستەیەک لە خەڵکی بە ترس و سڵەمینەوەوە مامەڵە لەگەڵ باس و خواسی عەقڵدا دەکەن، ئەمان تەنانەت هەندێک وێنەی بەڵگەکاری عەقڵیی دروست و پەسەندیشیان خستووەتە نێو بازنەی ڕەخنە و گازندەکانیانەوە، ئەوەش بەهۆی نقومبوونی زۆریانەوە لە ڕەخنەگرتن لە «ئەهلی کەلام» هاوکات لەگەڵ دەرک نەکردنیان بە جیاوازییە وردەکانی نێوان حەق و ناحەق لە پرسی عەقڵ و نەقڵدا.

دەستەیەکی دیکەش فوویان بە وشەی عەقڵدا کردووە و پاشان پڕیانکردووە لە وێنەگەلی هەوا و ئارەزوو و ڕا و بۆچوونی خراپ، شمشێری ئیرهابی فیکریش دژی هەرکەسێک بەرزدەکەنەوە کە لەگەڵ ئارەزوو و بۆچوونە ناپەسەندەکانیان ناکۆک بێت، بەجۆرێک ئەوەی ڕاجیا بێت لەگەڵیان بە چەقبەستوو و بیرتەسک و دژە عەقڵ تۆمەتباری دەکەن.

لەمانیش خراپتر دەستەیەکن کە هەر لە بنەڕەتەوە تانەیان لە پەیامی موحەممەدی داوە و بێباوەڕ بوون بە قورئانی پیرۆز، چونکە گومانیان وایە ئایەتەکانی لەگەڵ ڕاستییە نەگۆڕەکانی عەقڵی دروستدا تێکدەگیرێن، هەرگیز واش نییە، بەڵکوو تێکگیرانەکە تەنیا لەگەڵ گومانگەلێکی بێسەروبەر و لەرزۆکدایە کە ئەمان بە هەڵەشەیی و هەڵەتێگەیشتوویی پێشیان خستوون بەسەر ئایەتەکانی قورئاندا.

هەڵوێستی دروست و دادپەروەرانە لەگەڵ عەقڵدا ناوەندگرییە، بە کۆکردنەوە لەنێوان بوونی عەقڵ وەک سەرچاوەیەکی زانیاری لەگەڵ ڕێزگرتن لە سنوورەکانی کە ناتوانێت تێیان پەڕێنێت.

ئا لێرەدا ئاماژە بە هەندێک خاڵ و یاسای گرنگ دەدەم لەبارەی پرسی عەقڵ و نەقڵەوە و لەشێوەی چەند بڕگەیەکدا باسیان دەکەم:

قورئان خۆی پلەوپایەی عەقڵی بەدیارخستووە و بەڵگە عەقڵییەکانی بەکارهێناوە و بە گۆڕەپانێکی گرنگی داناون لە بەڵگەکاریدا،" هەروەها تەنیا ئەو وشانەی لە ڕەگە وشەی عەقڵەوە دروستدەبن لە قورئاندا پەنجا و نۆ جار هاتوون، هەمووشیان بەواتای سەرکۆنەی بیرنەکردنەوە و بەگەڕنەخستنی عەقڵ، ئەمە سەرەڕای ئاماژەدان بە هاوماناکانی، وەک (الألباب والأحلام والحجر) و باسی کارەکانی عەقڵ؛ وەک تێفکرین، یادخستنەوە، ڕامان، تێڕوانین، پەندوەرگرتن، تێگەیشتن و زانین) تفکر، تذکر، تدبر، نظر، اعتبار، فقه، و علم)."[١]

بەڵگە عەقڵییەکان دوو جۆرن: هەندێکیان بڕاوە و بێ چەند و چوونن) قطعی) کە هەموو خاوەن عەقڵەکان کۆکن لەسەریان، هەندێکیشیان گومانهەڵگرن (ظنی)، بەیەک چاو تەماشاکردنی ئەم دووانەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە پێچەوانەکردنی بەڵگە عەقڵییە بڕاوەکان لادان و سەفسەتەکارییە، بەڵام پێچەوانەکردنی بەڵگەی عەقڵی گومانهەڵگر بۆ بەڵگەیەکی لەپێشتر مامەڵەیەکی دروستە و پێچەوانەی عەقڵ نییە.

نموونەیەک بۆ بەڵگەی عەقڵی بڕاوە، ئەوەی کە» هەموو بەدیهێنراوێک دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت«، ئەمە پێویستییەکی عەقڵی بێگومانە و هیچ کەس لاری لێی نییە مەگەر کەسێکی لەخۆبایی و خۆبەگەورەزان، هەر

---

(١) الأدلة العقلية النقلية، سعود العريفي (٣٨).

بەم بەڵگەیەش بەڵگە دەهێنینەوە لەسەر پێویستی بوونی بەدیهێنەرێک بۆ ئەم بوونە، لەبەرئەوەی لە نەبوونەوە هاتووەتە بوون.

هەرگیز ناشگونجێت بەڵگەیەکی عەقڵی بڕاوە لەگەڵ هیچ بەڵگەیەکی دیکەی بڕاوە و بێگومان -عەقڵی بێت یان هەواڵی یان هەستپێکراو- ناکۆک بێت، هەر بەڵگەیەکیش لەگەڵ بەڵگە بڕاوە و بێگومانەکاندا تێکبگیرێت یان بەڵگەیەکی گومانهەڵگرە یان هەر لە بنەڕەتدا ڕاست نییە.

هەروەها بەڵگە نەقڵییەکانیش هەندێکیان لەڕووی سەلمێنراوییەوە گومانهەڵگرن کە پێیان دەگوترێت(ظنی الثبوت)، بەم پێیە ئەگەر وای دابنێین تێکگیرانێک هەبوو لەنێوان بەڵگەیەکی نەقڵی لەم جۆرە و بەڵگەیەکی عەقڵی بڕاوە (قەتعی) و تێکگیرانەکەش لە هەموو ڕوویەکەوە بوو، ئەوکات بەڵگە بڕاوە و بێگومانەکە پێشدەخرێت، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە -واتە لە باری تێکگیرانی بەڵگەیەکی عەقڵی گومانهەڵگر لەگەڵ بەڵگەیەکی نەقڵی بڕاوە و بێگوماندا بەدڵنیاییەوە بەڵگە نەقڵییەکە وەردەگیردرێت-.

لەگەڵ بیرهێنانەوەی ئەوەی کە فەرموودە یەکرێکان (ئاحاد) تیایاندایە بڕاوە و (قەتعی)یە و تیایاندایە گومانهەڵگر (ظنی)، واتە هەموویان گومانهەڵگر نین، ئەمەشم لە چەندین ڕووەوە سەلماندووە لە هەردوو پەرتووکی (تثبیت حجیة السنة)[١] و (سابغات)[٢]. [٣]

گرنگی جیاوازیکردن لەنێوان سەرسامکەران لە ڕووی عەقڵەوە لەگەڵ

---

(١) تثبیت حجیة السنة (لاپەڕە ٨٢-٨٣).

(٢) سابغات، الطبعة الثالثة (لاپەڕە ١٣٧-١٣٨).

(٣) هەریەک لەم دوو پەرتووکە بەکوردیکراون، یەکەمیان بە ناونیشانی «بەڵگەیەتی فەرموودە» و دووەمیان بەناوی «قەڵغانەکان» بە شێوەزاری کرمانجی خواروو-سۆرانی، هەروەها بەناوی «کومزری» بە شێوەزاری کرمانجی ژووروو. -وەرگێڕ-

ئەستەمەکانی عەقڵ، واتە: جیاکردنەوەی ئەو بابەتانەی عەقڵ بەدووریان دەگرێت و سەری مرۆڤ لێیان سووڕدەمێنێت لەگەڵ ئەو بابەتانەی کە لە ڕووی عەقڵەوە ناشێت ڕاستبن. چونکە شەریعەت دەگونجێت شتێکی بهێنێت کە عەقڵ سەراسیمە بکات، بەڵام هەرگیز شتێک ناهێنێت کە لە پێودانگی عەقڵدا ئەستەم بێت یان دژیەکی لەگەڵ عەقڵدا بێت!

ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت.) لە پەڕتووکی (الجواب الصحيح)دا دەفەرموویت: «يجب الفرق بين ما يعلم العقل بطلانه وامتناعه، وبين ما يعجز العقل عن تصوره ومعرفته : فالأول من مُحالات العقول، والثاني : من محارات العقول، والرّسل يُخبرون بالثاني»[1]

واتە: «پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەو شتانەی کە عەقڵ دەزانێت پووچ و ناڕاستن لەگەڵ ئەوشتانەی کە عەقڵ دەستەوسانە لە بیرلێکردنەوە و زانینیان، چونکە یەکەمیان لە ئەستەمەکانی عەقڵن و دووەمیان لە سەرسامکەرانی عەقڵن، پێغەمبەرانیش هەواڵ لە جۆری دووەمیان دەدەن.» هەر لە هەمان پەڕتووکدا دەفەرموویت: «الأنبياء عليهم السلام قد يخبرون بما يعجز العقل عن معرفته، لا بما يعلم العقل بطلانه، فيخبرون بمحارات العقول لا بمحالات العقول»[2]. واتە: «پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێ بێت.) دەشێت هەواڵ لەبارەی شتانێکەوە بدەن کە عەقڵ لە ئاست زانینیاندا دەستەوسانە، نەک شتانێک کە عەقڵ دەزانێت ناڕاستن، واتە هەواڵ لەمەڕ سەرسامکەرانی عەقڵ دەدەن نەک ئەستەمەکانی عەقڵ.»[3]

---

(١)الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح، ابن تيمية (٣٩١/٤).

(٢) سەرچاوەی پێشوو (٤٠٠/٤)

(٣) سابغات (لاپەڕە ١٦٠-١٦١) بۆ خاڵی سێیەم سوودی لێ بینراوە.

ئەو دەق و بەڵگە شەرعییانەی کە لەبارەیانەوە دەگوترێت: پێچەوانەی عەقڵن و لەگەڵیدا تێکدەگیرێن، لەدوای پەیگیری و بەدواداچوونیان دەردەکەوێت کە بەو شێوەیە نین، لەڕاستیدا ئەوانەی هێندە باسی ئەو تێکگیرانە دەکەن هیچ لێکۆڵینەوە و پشکنینێک ناکەن بۆ ڕووەکانی کۆکردنەوە و تەبایی کە دەکرێت لەنێوانیاندا هەبێت، لەکاتێکدا زانایانی لێکۆڵەر و موحەقیق لە زانستی )أصول الفقه) و زانستی فەرموودە گرنگییەکی زۆریان داوە بە کۆڵینەوە لە پرسی ناکۆکی و تێکگیران لەم بوارەدا و تا ئەوپەڕی بایەخیان پێ داوە، چەندین هەنگاوی تۆکمە و ڕێکخراویشیان خستووەتە ڕوو بۆ مامەڵەکردن لەتەک ئەو بەڵگانەی گومانی تێکگیرانیان دەکرێت لە گەڵ عەقڵدا، هیچ کات لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵەیان نەکردووە کە بشێت شەرعی خودا ناتەبایی هەبێت لەگەڵ ئەوەی بەڵگە عەقڵییە ڕاستەکان پێویستی دەکەن، بەڵکوو لەسەر بنەمای تێکنەگیرانی نێوان بەڵگە ڕاستەکان لە هەر جۆرێک بن؛ هەواڵی یان عەقڵی یان هەستپێکراو.

لە گەورەترین هۆکارەکانی هەڵەتێگەیشتن لەو بەڵگە و حوکمە شەرعییانەی بانگەشەی تێکگیرانیان دەکرێت لەگەڵ عەقڵدا ئەوەیە کە کەسەکە تێگەیشتنی تاکەکەسی خۆی بە پێوەر دادەنێت بۆ عەقڵ، هەرچی ئەو قەبوڵی کرد ئەوە لەگەڵ عەقڵ تەبایە و هەرچیش ئەو ڕەتی کردەوە ئەوە دژی عەقڵە، ئەمەش پاساوێکی نارەوایە، چونکە چەندین هۆکار هەیە وا لە مێشک و بیری مرۆڤ دەکەن شتێک ڕەت بکاتەوە، لەوانە سروشتی گەشەکردن و پێکهاتنی، ڕادەی فراوانی زانیارییەکان تێیدا، دەستمایەی ئەزموونی کەسەکە خۆی و هۆکارگەلێکی تریش. کەواتە؛ کارێکی نەشیاوە پەلەبکرێت لە بانگەشەی تێکگیران لەگەڵ عەقڵ، چونکە لەوانەیە هۆکاری ڕەتکردنەوەکە بۆ سروشتی تایبەت بە کەسی نکووڵیکار بگەڕێتەوە و لەسەر هەموو خاوەن عەقڵان نەگشتێنرێت.

ASTANA

## گومان خستنەسەر ئیسلام بەهۆی بەجێماوی موسڵمانان

زۆرێک لە بێدینان و گومانکاران لە ئیسلام بەردەوام ئەم پرسیارگەلە چەندبارە دەکەنەوە، بۆچی جیهانی ئیسلامی لە دواوەی جیهانی ڕۆژئاوا و دەوڵەتە بێئایینەکان دەژی لە ڕووی پیشەسازی و تەکنەلۆژیا و سەربازییەوە؟ ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ناڕاستێتی ئیسلام؟ بۆچی هێندە کوشتار لەناو موسڵماناندا ڕوودەدات لەکاتێکدا مولحید و بێدینەکان بە ئاشتی دەژین؟

کاتێک لەم پرسیارانە و ئەو بڕیارانەی لەسەریان بنیاتدەنرێن ڕادەمێنین بۆمان دەردەکەوێت کە بڕێکی بەرچاو لە هەڵەکاری و خراپ پێوەرییان تێدایە، هەروەک ئەندازەیەکی زۆر لە دژەپرسیار لەگەڵ خۆیاندا دێنن کە بارلاری و نالەباری هەڵوێستی پرسیارکەران دەردەخەن نەک پرسیارلێکراوان، لێرەدا لەشێوەی چەند خاڵێکدا ئاماژە بەمە دەدەم:

**یەکەم**: کێشەی گشتاندن، واتە ئەم گومانکارانە دێن هەڵەیەک کە تاکێکی موسڵمان یان کۆمەڵێکی موسڵمان تێی دەکەوێت لەسەر کۆی موسڵمانان دەگشتێنن تا هەمووی بلکێنن بە ئیسلامەوە، ئەگەرچی موسڵمانان بە شەو و ڕۆژ بەریبوونی خۆیان لەو کارانە نیشانبدەن.

**دووەم**: لە گەورەترین تاوانەکانی کوشتار کە لە سەردەمی نوێدا دەرهەق بە مرۆڤایەتی ئەنجامدراوە لە جەنگی جیهانی دووەمدا بوو، کە ژمارەی قوربانیانی گەیشتە زیاتر لە پەنجا ملیۆن کوژراو، لایەنەکانی جەنگیش تێیدا تەنیا بێئایین و سیکۆلار و نەسرانییەکان بوون، هەمان ئەو ئاڕاستانەی کە ئێستاکە شوێنکەوتووانیان گومان لەسەر ئیسلام دەوروژێنن، کەواتە هەر بەپێی ئەم لۆژیکە ئێمەش دەتوانین هەمان ئەو

گومانەیان لەسەر بوروژێنین، خۆ ئەگەر تاوانەکانی ڕژێمی کۆمۆنیستی وەک بەڵگەیەک وەربگرین لەسەر تاوانکاری مولحیدان تەنیا ئەوە بەسە بۆ بنکۆڵکردنی بیر و بانگەشەیان بە هەمان ئەو ڕێگایەی خۆیان هەوڵدەدەن گومانی پێ لەسەر ئیسلام دروستبکەن، ئەگەریش دەڵێن: کۆمۆنیستەکان نوێنەرایەتی بێدینان ناکەن، ئێمەش پێیان دەڵێین: بە هەمان شێوە هەموو موسڵمانێک نوێنەرایەتی ئیسلام ناکات.

**سێیەم**: لە گەورەترین هۆکارەکانی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لە سەردەمی نوێدا ئەو هەڵمەتە داگیرکارییە بوو کە فەڕەنسا و بەریتانیا ئەنجامیاندا لەسەر جیهانی عەرەبی و جیهانی ئیسلامی بەگشتی، ئەم هەڵمەتانەش لەو سەردەمەدا نەبوون کە بە سەدە تاریکەکانی ئەوروپا دەناسرێن، بەڵکوو لەدوای سەردەمی ڕۆشنگەری و ئازادی و مافی مرۆڤ بوون، کەواتە با نموونەی ئەم داگیرکارییانە بەس بن بۆ کەوتنی لاف و بیری ڕۆشنگەری و ئازادییە ڕۆژئاواییەکان!

**چوارەم**: ئێمە باوەڕمان وایە کە پارێزراوی لە هەڵە بۆ هیچ کەسێک نییە لەدوای پێغەمبەران، باوەڕیشمان وایە کە موسڵمانان لە ئاستی تێگەیشتنیان بۆ ئایینەکەیان و دەستگرتنیان پێیەوە چوونیەک نین، بۆیە هەر کارێک کە تاکێکی موسڵمان یان کۆمەڵێکی موسڵمان ئەنجامی دەدات شیانی لێوەرگرتن یاخود ڕەتکردنەوەی هەیە بەپێی ئەندازەی کۆکبوونی کارەکەی لەگەڵ قورئان و سوننەت و کۆڕای زانایانی ئیسلام، لەبەرئەوەی داوەری تێگەیشتن لە ئیسلام نابرێتەوە بۆلای هەڵسوکەوتی تاکەکان بەڵکوو تەنیا بۆلای دەقە بنەڕەتییەکانی و بۆ مامەڵەی کۆی شوێنکەوتووانی ئایینەکە، بە هەمان شێوە مەرج نییە هەرکەسێک خۆی بە موسڵمان دانا نییەتپاک و نیازباش بێت بۆ ئەم دینە، چونکە کەسانێک هەن بە ڕووکەش خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام بەڵام لەڕاستیدا دژایەتی دەکەن، هەروەک خودای گەورە لە زۆرێک لە ئایەتەکانی پەڕتووکە بەرز

و بەشکۆکەیدا سیفەتی دوورِووانی باسکردووە، باسی ئەوەشی کردووە کە دڵسۆزی و پشتگیری ئەوان هەر ڕووەو دوژمنانی ئەم ئایینە ئەگەرچی بە ڕواڵەت لەگەڵ موسڵمانانیش بن.

بۆیە کاتێک دەمانەوێت ڕاستییەتی ئیسلام ببینین، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکانی: پەڕتووکی خودا و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، کە نموونەی تەواوی بەرجەستەکردنی ئیسلامە- وەک دایکمان عائشە (خودا لێی ڕازی بێت) لەبارەیەوە دەفەرمووێت: «كان خُلُقُه القرآن»[1] واتە: «ڕەوشت و ئاکاری ئەو قورئان بوو.»

شایەتی و بەڵگەکانی مێژووش پێمان دەڵێن کە بە ئەندازەی نزیکبوونەوەی موسڵمانان لە دینەکەیان و دەستگرتنیان بە ڕێساکانی خودای باڵادەست لە بوونەوەردا سەربەرزی و شکۆمەندی لە دونیادا بەدەستدەهێنن و قسەی گوێ بۆگیراو و ڕێزلێگیراویان دەبێت تیایدا.

**پێنجەم**: پێشکەوتنی ڕۆژئاوا لە ڕووی شارستانییەتی و ماددییەوە لەم سەردەمەدا بەهۆی دەستگرتنیانەوەیە بە ڕێسا و هۆکارەکانی پێشکەوتنی ماددی کە خودای گەورە بە دادگەری بۆ هەموو دروستکراوەکانی داناوە، چونکە ئێمە باوەڕمان وایە خودای گەورە یاسا و سوننەتگەلێکی لە بووندا داناوە، کە بێگومان هەرکەسێک دەستیان پێ بگرێت و کاریان پێ بکات بەرهەمەکەیان دەچنێتەوە ،ئەگەرچی بێباوەڕێکی دەرچوو لە فەرمانی خودای گەورەش بێت، لەبەرئەوەی خودای گەورە بە ئەندازەی کۆشش و لێبڕان بە هەر مرۆڤێک دەبەخشێت.

**شەشەم**: هەڵەیەکی گەورەیە پێوەری سەرکەوتن و پێشکەوتن تەنیا ببرێتەوە بۆ لایەنی ماددی، چونکە ترۆپکی پێشکەوتن لە جیهانی ماددەدا،

---

(١)مسند أحمد (٢٤٦٠١) واللفظ له، وصحيح مسلم (٧٤٦).

تەنیا بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی مرۆڤە لەم دونیایەدا، ئەمەش ئەو ئامانجە نییە کە خودا لەپێناویدا مرۆڤی خوڵقاندووە، تەنیا کەسێکیش ئەم ڕاستییە دەفامێت کە لە بەڵگەکانی ئیمان و ڕاستێتی ئیسلام ڕابمێنێت- لە سەرەتای ئەم پەڕتووکەدا ئاماژەمان بەو بەڵگانە دا- ، بۆیە ئەم پێشکەوتنە ماددییە بەبێ بەدیهێنانی ئامانجە مەزنەکە (کە بەندایەتی و پەرستشە بۆ خودای گەورە و بێ هاوتا و گوێڕایەڵی فەرمانەکانییەتی) هیچ بەهایەکی نییە، بەڵکوو ئەوە خۆی دەبێتە یەکێک لە هۆکارەکانی لەخۆبایی بوونی مرۆڤ و زۆرداری و سەرکەشی.

**حەوتەم**: ئەوەی دەدرێتە پاڵ موسڵمانان لە بەجێماوی و دواکەوتوویی و شەڕ و کوشتار، چەند هۆکارێکی هەیە، لەوانە نەبوونی ویست و ئیرادەی ڕاستگۆیانەی گرێدراو لەگەڵ کاری هۆشیارانە لای زۆرێک لە موسڵمانان بۆ هەستانەوەی ئوممەت، هۆکارگەلێکی دیکەش کە بە ئاشکرا یاخود نهێنی دەستی دەرەوەی موسڵمانانی تێدایە، بێگومان پرسی وڵاتێکی وەک سوریاش لەم دواییانەدا بەڵگەیەکی بەرچاوە بۆ ئەمە، کە هەردوو هۆکارەکەی پێکەوە تێدا کۆبوونەوە، لە لایەنی ناوخۆییەوە دووبەرەکی و دەستگرتن بە بۆچوون و پلەوپایە هۆکاری درەنگخستنی سەرکەوتن و سەقامگیرین، لەلایەنی دەرەکیشەوە دەستوەردانی وڵاتانی وەک ڕوسیا و ئەوانی تریش زۆرترین کاریگەری هەبووە لەسەر درێژەدان بە نەهامەتی و کارەساتەکان، مەگەر چەندین جار تاوانەکانیانمان نەبینی و تا ئێستاش دەبینین لە بۆردومانی ماڵ و نانەواخانە و بازاڕ و دانیشتوان و خەڵکی بێتاوان بە شێوەیەکی وەحشیگەرانە، ئەو تاوانانە لەکوێوە سەرچاوەیان گرت؟ مەگەر لە ئیسلامەوە بوون؟

ئەگەر بواری زیاترمان هەبووایە لە چەند ڕوویەکی تریشەوە وەڵامی ئەم گومانەم دەدایەوە، بەڵام دەخوازم ئەوەی باسکرا بەس بێت.

# ناوەڕۆک



## بەشی یەکەم



## بەشی دووەم



ASTANA

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم




لەم پەڕتووکەدا کۆمەڵێک پرسی گرنگ و هەستیار خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لەوانە:

- بەڵگەکانی بوونی خودای بێهاوتا - بەڵگەکانی پێغەمبەرییەتی موحەممەد (ﷺ) و ڕاستییەتی قورئان - ئامانجی بوون - حیکمەت لە بوونی شەڕ و نەهامەتی - جوانییەکانی ئیسلام - ملکەچی بۆ فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) - بەڵگەیەتیی سوننەت - بەڵگەیەتیی ئیجماع - ئایین بە تێگەیشتنی کێ؟ - لەنێوان دەقەکانی شەریعەت و ئامانجەکانیاندا - بۆچی زانایان ڕاجیا دەبن؟ - حەقیقەت لەلای کێیە؟ - بانگەشەی ستەملێکراویی ئافرەت لە ئیسلامدا - ئایین و ئازادی - ئایین و عەقڵ

ئەمانە و چەندین بابەتی هەستیاری تر، لەم پەڕتووکەدا گفتوگۆی لەسەر کراوە، ئەم پەڕتووکە بەرچاوڕوونی بە خوێنەر دەدات لەسەر شێوازی مامەڵەی دروست لەگەڵ پرسی گەڕاندنەوەی دڵنیایی و چەسپاندنی بنەماکان.